

# پاداشت

گۆڤارێکی مانگانەی رۆشنبیرییە

16



## بیروباوەڕی ئیسلامی

## تەفسیری قورئان

## فیقهی ئیسلامی

## لەخزمەت فەرموودەدا

## ئێمەی مسوڵمان چیمان بۆ زانست کردووە؟



## زانستی قورئان

## بیدعەچیەکان کێن؟

## دابەشکردنی میرات لەئیسلامدا

## نیشانەکانی قیامەت چیە؟

## تاقیکردنەوەی خوا بۆ مرۆڤەکان چیە و چۆنە؟






پرسیار: واجبەکان یا ئەرکانەکانی خۆشۆردن(غسل)چیە؟ و خۆشۆردنێکی تەواو چۆنە؟

وەڵام: خۆشۆردن یاخود غوسل دەرکردن واجبی سەرشانی هەموو مرۆڤێکەو وا باشە لە کەمترین ماوە ئەو کەسە خۆی بشۆرێ و پاکبێت بۆ ئەوەی پەرستشەکانی ئەنجامبدات لەکاتی خۆیدا، غوسل: واتا ئاو هێنان یا ئاوبەرکەوتن بەهەموو لاشەی مرۆڤ، بۆ لابردنی لەشپیسی، جا پایەو ئەرکانەکانی دووانە:

یەکەم: نیەتهێنان: ئەویش جێگاکەی دڵە، یانی مەبەستی لابردنی لەشپیسی بێت.

دووەم: گەیاندنی ئاو و شۆردنی هەموو لاشەی.

خۆشۆدنی تەواو(یانی وەکو پێغەمبەرﷺ)ئەنجامی داوە، ئاوایە: هەردوو دەستی دەشۆرد، دواتر بە دەستی ڕاستی ئاوی دەکردە دەستی چەپی و داوێنی دەشۆرد، دواتر دەستنوێژی دەگرت، دواتر سەری دەشۆرد تا دڵنیادەبوو سەری تەڕبووە سێ مستی بەسەریدا دەکرد، دواتر ئاوی بەهەموو لاشەیدا دەکرد ئەویش سێ جار، حەز بەوەکردووە لای ڕاستە پێشی چەپە بخات.

**دەتوانن: پرسیارەکانتان بەشێوەی نامە( رسالە ) بۆ ئەم ژمارەیە بنێرن: ٠٧٥٠٥٦٥٤٥٠٩**




بێگومان هەموو ئامێرو بەکاربەرێك کە سوودی هەبێت بۆ مرۆڤایەتی ئەوا حەوجە بەوە دەکات مەردوومی بە ڕێکی بەکاری بێنێ. دیارە خێر ئەو شتانە لایەنی ئەرێنی و نەرێنی لەخۆدەگرێ، جا کۆمەڵگای ئیسلامی و بابای موسڵمان هەر ئەوەی لێدەپشکوێ کە لایەنە چاك و بەسوود و ئەرێنیەکەی هەڵدەبژێرن. یەکێك لەو ئامێرانە تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانەو لەنێویدا فەیسبووك، کە بەندە بەکورتی لە چەند خاڵێك کورتی هەڵدێنین لەوانە:

*بەر لەهەموو شت دەبێت نیەتمان پاکبێت کاتێ کار بەو ئامێرانە دەکەین، دواتر دەبێت (ئەکاونت) یاخود(پەیج)ەکەمان بەناوی خۆمان یاخود ناوێکی شیاوبێ، بۆ ئەوە بناسرێی و بابەتەکانت کاریگەری خۆی بنوێنێ، بابەتی جوان و ڕێك و بەسوود و شەرعی بڵاودەکەینەوە یاخود (لایکی)دەکەین، دەبێ وریای کات بێ و لەکاتی بەکارهێنانیدا کاتی گونجاو بەکاربهێنین، وە نابێت لەسەر هەژماری شەرع و پەرستشەکان بێت، یانی: نوێژو یادی خوای لەسەر دانێین.

لەم ڕێگەوە هاوڕێ و برایانمان بەسەر دەکەینەوە، وە شتێکی دیکە کە دەبێت لە ئاستیدا بوەستێن ئەوەیە کە لەکاتی کۆمێنتدا وتەی جوان و ناشایستە نانوسێن و بەچاوێکی کەمەوە بۆ بۆچوونی کەس ناڕوانێن ئەمما کاتێ قسەو بۆچوونێکی جیاوازمان هەبوو لە چوارچێوەی شەرع و مرۆڤایەتیدا مامەڵەدەکەین، وە ئەم مینبەرەش دەکەینە شوێنێ بۆ بڵاوکردنەوەی شەرع و زانست، نەوەکو تەنها کات بەسەر بردن و لە تەمەن کەمکردنەوە.



ژمارە ١٦

بووەرگرتلی پاداشت (پاداشت) بخوێنەوە

# پاداشت

﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴾

ژ: متمانەی سەندیکا (٢١٣)   گۆڤارێکی مانگانەی ڕۆشنبیری گشتیە   محرم ١٤٣٥کۆچی-تشرینی دووەم٢٠١٢میلادی

## لەم ژمارەیەدا







خاوەنی ئیمتیاز

عەبدولخالق موحەممەد

سەرنووسەر

نەهرۆ عەلی حەمەد

پەیوەندی
٠٧٥٠٥٦٥٤٥٠٩

nahrohamad86@gmail.com


بۆ زیاتر خوێندنەوەی بابەتەکان سەردانی پەیجی گۆڤارەکەمان بکەن بەم ناونیشانەی خوارەوە
facebook.com/گۆڤاری پاداشت

لە دوعای خێر بێ بەشمان مەکەن

# بیروباوەڕی ئیسلامی

## زنجیرەی چوارەم

بەناوی خوا... دوای ئەوەی لە زنجیرەی رابردوو باسی واتای وشەی تەوحید و ئەرکانەکان و سوود و گرنگیمان کرد، لەم زنجیرەیەش باسی مەرجەکانی وشەی تەوحید و تاکپەرستی دەکەین:

**مەرجەکانی ( لاإله إلا الله )**

وشەی تەوحید وەکو چۆن دوو ئەرکانی هەبوو، ئاوەهاش چەند مەرجێکی هەیە، ئەگەر هاتوو یەکێك لەم مەرجانەی تیا نەبێت وشەکە دانامەزرێ و وەرناگیرێ.

**یەکەم: زانست(العلم)**: بریتیە لە زانین و ناسینی خوای پەروەردگار و پێغەمبەر و ئایینەکەی، بەڵگە بۆ ئەمە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ ﴿١٩﴾ ﴾ محمد، واتە: کەواتە دڵنیابە و بزانە بێجگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی بەڕاست نییە وە داوای لێبوردن بکە لە خوا بۆ گوناهی خۆت.

**دووەم: دڵنیابوون(الیقین)**: بریتیە لە یەقینێکی تەواو، بە خوای پەروەردگار کە بەڕاستی پەرستراوی هەقە، وەکو خودای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ الحجرات. واتە: بێگومان ئیمانداارانی ڕاستەقینە ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوە بە خودا و پێغەمبەرەکەی پاشان دوو دڵ نەبوون لە(ئیمانەکەیاندا) وە بە ماڵ و گیانیان تێکۆشانیان کردووە لە پێناو ڕێبازی خودا، هەر ئەوانەن ڕاستگۆیان.

بەو مانایەی لە باوەڕبوونی بەخواو پێغەمبەرەکەی و ئەوەی لە ئاییندا هاتووە هیچ گومانێکی نەبێت و لەو پەڕی دڵنیایی بێت.

**سێیەم: خودا ویستی (الاخلاص)**: بریتیە لەوەی هەموو عیبادەتەکان بۆ خوابێ بەتەنها، نابێت لە عیبادەدتەکاندا شتێك ئەنجام بدات بۆ غەیری خودا، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ﴿٥﴾ ﴾ البینة. لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرمانیان پێ نەدرا بوو مەگەر بەوەی کە پەرستنی خودا بکەن بە دڵسۆزی وملکەچی.

**چوارەم: ڕاستگۆیی(الصدق)**: بریتیە لەوەی ڕاستگۆبێ لە وتنی وشەی تەوحید، بەوەی دڵ و زمان و کردەوەکان هاوتای وشەی تەوحیدبن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾

العنكبوت.

واتە: ئایا خەڵك وا دەزانن كە وازیان لێ دەهێنرێ ئەگەر بڵێن بڕوامان هێناوە ئیتر تاقی ناكرێنەوە؟ سوێند بەخودا بێگومان كەسانی پێش ئەوانمان تاقی كردەوە(ئەمانیش تاقی دەكەینەوە) ئینجا بێگومان خودا ئەو كەسانەی ڕاستیان كرد دیاری دەكات درۆزنەكانیش دیاری دەكات واتە دەناسرێن.

**پێنجەم: خۆشویستن (المحبة):** بریتیە لە خۆشویستنی خوا و پێغەمبەرەكەیی و ئەوەی وشەی تەوحید داوای دەكات، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ ﴿١٦٥﴾ ﴾ البقرة. واتە: وە كەسانی وا هەیە لە خەڵكی كە هاوبەشی زۆر بۆ خودا پەیدا دەكەن، خۆشیان دەوێن وەك خۆشەویستی (ئیمانداران بۆ) خودا بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە زۆر زیاتر خودایان خۆش دەوێت.

**شەشەم: ملكەچی(الانقیاد):** بریتیە لە پەرستنی خوای گەورە بەتاك و تەنها وە بریتیە لە ملكەچی بۆ شەریعەتەكەی و باوەڕبوون پێی و بەڕاست زانینی و ڕازی بوون پێی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ ﴿٥٤﴾ ﴾ الزمر. واتە: وە بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان وە گەردنكەچ بن بۆی.

**حەوتەم: وەرگرتن(القبول):** وەرگرتنی وشەی تەوحید و ئەوەی داوای دەكات و خوداوەندی عیبادەتەكان و وازهێنان لە عیبادەت بۆ غەیری خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓا۟ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴿٣٦﴾ ﴾ الصافات.

واتە: بەڕاستی هەر كاتێ بەوانە بوترایە هیچ پەرستراوێك نییە بێجگە لە خوا خۆیان بەگەورە دەزانی(و ملكەچی نەدەبوون). وە دەیان وت: ئایا ئێمە پەرستراوەكانمان واز لێ بێنین؟ لەبەر شاعیرێكی شێت.



**هەشتەم: بێباوەڕبوون بە تاغوت(كفر بالطاغوت):** بریتیە لە بەریبوون لەهەموو عیبادەتێك بۆ غەیری خودا و ئەوەی لە غەیری خوا دەپەرسترێ دەبێت بڕوامان وابێت كە هەمووی پوچ و بەتاڵن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ النحل. واتە: سوێند بە خوا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێكدا پێغەمبەرێكمان ناردووە بەمەی تەنها خودا بپەرستن و دووركەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێكی تر.

# زانستی قورئان

## علم الحديث

ئا:یاداشت- زنجیرەی یەکەم

بەناوی خودا، ئێمە لەم ژمارەوە هەڵدەستین بەخستنەڕووی هەموو لایەن و باسەکان دەربارەی ئەم زانستە کە زانایان لێوەی دواون.

**واتای قورئان لە زماندا:** ئەم وشەیە چاوگە، هاوتایە بۆ خوێندنەوە.

**پێناسەی قورئان:** (القرآن: هو كلامُ الله المعجز المنزل على النبي محمد(ﷺ) المكتوب في المصاحف، المنقول عنه بالتواتر، المتعبد بتلاوته).

یانی: قورئان:بریتیە لە وتەی خوای پەروەردگار کەسەرسامکارو دەستەوسانکارەو دابەزیوە بۆ سەر نێراوی خۆی موحەممەد(ﷺ) کە لە دوو توێی موصحەفەکان نوسراوەو نەخشێنراوە، بەشێوەی تەواتور گوازراوەتەوەو خوێندنەوەیشی بە خواپەرستی دادەنرێ.

**ناوەکانی قورئان**

١-القرآن: قورئان وەرگیراوە لە وشەی (قیرائە) واتا: خوێندنەوە.

بەڵگە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة.

واتە: مانگی ڕەمەزان مانگێکە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارەوە بە ڕێنما بۆ خەڵکی وە بەڵگەیانی ڕۆشن بۆ ڕێنموونی و جیاکردنەوە(ی دروست و نادروست).

٢- الکتاب: وەرگیراوە لە وشەی(کتابة) واتە: نووسین، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تێدانییە ڕێ نیشاندەری پارێزکارانە.

٣- الفرقان: واتە جیاکەرەوە، واتا جیاکەرەوەی هەق لە ناهەق،

خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ﴾الفرقان.

واتە: گەورە و پیرۆزە ئەو زاتەی کە فورقان(قورئان)ی بۆ سەربەندەی خۆی ناردۆتە خوارەوە تا ترسێنەر بێ بۆ هەموو جیهانیان.

٤- الذکر: واتا یاد، قورئان هۆیەکە بۆ زیکر و یادی کردنی خوای گەورە، خوای بالادەست دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾الحجر.

واتە: بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە و بەڕاستی هەر ئێمەش دەی پارێزین.

# وتەی خوای کاربەجێ

# تەفسیری قورئانی قسەلەجێ

ن: ئەهرۆ عەلی حەمەد - بەشی: چوارەم

الحمدلله والصلاة والسلام علی رسول الله (ﷺ) اما بعد: بەپشتیوانی خوای گەورە وا هاتینەوە خزمەت ئایەتێکی تر، لە سورەتی ئەلبەقەرە، کە ئایەتی سێیەمە.

**تەوەری ئەم ئایەتە**

ئەم ئایەتەش خۆی لەتەوەرەکانی بڕوا (الإیمان)و شتە پەنهانەکان و بەرپاکردنی نوێژو بەخشین دەدۆزێتەوە.

**دەقی ئایەتەکە**

خوای کاربەجێ لەقورئانی قسەلەجێ دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ③ ﴾

واتە: (ئەوان کەسانێ، بڕوا دێنن بە شتانێ کە بەرچاونین و پەنهانن، وە نوێژ بەرپادەکەن و لەو ڕۆزیەش کە بەردەستە، دەیبەخشن).

**ڕاڤەو سەرنجێ**

یەکەم: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ﴾: ئەوکەسانەی کە بڕوا دێنن بە خوای پەروەردگار، بڕوا (الإیمان)ش بریتیە: (قول القلب واللسان، وعمل القلب و اللسان والجوارح، یزید وینقص).

یانی: قسەی دڵ و زمان، وە کردەی دڵ و زمان، وە ئەندامەکان، وە ئیمان زیاد دەکات و کەم دەکات.

ئەڵبەت ئەوانە باوەڕێکی تەواو پتەویان هەیە بە شتە نادیارو پەنهانەکان، کە بەهەستەکان دەرك ناکرێ وەکو: زاتی خواو سیفەتەکانی، یاخود فریشتەکانی خواو زیندووبوونەوەو بەهەشت و خۆشیەکانی و دۆزەخ و سزاو ئێش و ئازارەکانی وگۆڕو بەرزەخ و تەواوی ئەو شتانەی کە خوای گەورە لەقورئاندا هەواڵی پێداوەو ئەوەیشی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێناویەتی لەلایەن خواوە هەواڵی لێداوەو پێداوە، بڕوادارانیش بەبێ دوودڵی وەری دەگرن و بڕوا دەهێنن.

شتە نادیارەکان: دیارە ئەوانەن کە دڵ، باوەڕیان پێ دەهێنێ و مەرج نیە بەچاوی سەر ببینرێ، جا باوەڕبوون و ئیمان بەشتە پەنهانەکان کلیلی تەقواو پارێزکاری و هەموو چاکەیەکە وەکو لە ئایەتی پێشوو بەیانکراو لە پێش نوێژو بەخشینش هاتووە.

ئیمان بە شتە نادیارەکان، بابای موسڵمانی پێ لە بێباوەڕ جیادەکرێتەوە، چونکە باوەڕ بەشتێ دێنێ کە تەنها خواو پێغەمبەر (ﷺ)هەواڵیان پێداوە، بگرە هەندێك عەقڵیش باوەڕی پێناکات بەو واتایەی وەکو وتمان نە چاو بینیویەتی و نە هەست بۆی چووەو نەعەقڵ پێی دەشکێ، کەچی بابای موسڵمان باوەڕی

، ئەمەش وای کردووە بچێتە
ان و پارێزکاران.
 دەڵێ: (بالغیب:ما جاء
ن الله جل ثناؤه)یانی بە
ەکان، ئەوەی کە لەلایەن
نووە، یانی: لەلایەن خوای

ەڵێ: (آمنوا بالجنة والنار،
و، بعد الموت، وبیوم القیامة، وکلُ هذا غیبٌ). بڕوابوونە بە بەهەشت و دۆزەخ و زیندوبونەوە دوای مردن و بەرۆژی پەسلان و هەموو ئەوانە غەیبن.

دووەم:

﴿ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾: نوێژ دووەم پایەی ئیسلامەو لەدوای شایەتی بەخواو پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە، وە ئەو پەیمانەیە کە لەنێوان موسڵمان و کافرێ دایە وەکو لەفەرمودەی صەحیح هاتووە هەرکەسێ وازی لێبنێ (فقد کفر)ئەوە کوفری کردووە، ئەم باسە پێویستی بەتوێژینەوەیە لەکاتی خۆیدا بە درێژی لێوەی دەدوێین، بەوەی ئایا نوێژنەکەر لە بازنەی ئیسلام دەمێنێ یاخود نا؟.

نوێژ بەرپاکردن دەبێ لەکاتی خۆیدا جێبەجێ بکرێ و مەرجەکان و ئەرکانەکان و سوننەتەکانی تێدا بەرجەستەبێ.

ابن عباس دەڵێ: (بەرپاکردنی نوێژ یانی: تەواوی لە کرنوش و سوژدەو خوێندنەوەو بەخشوعەوەبێ.

قتادە دەڵێ: (إقامة الصلاة: المحافظة علی مواقیتها، وضوئها، ورکوعها، وسجودها).
 یانی پارێزگاری کردن لە کاتەکانی و دەستنوێژو روکوع و سوژدەکانی.

دیارە نوێژبەرپاکردن کۆڵەگەی دینەو هەرکەسێ بەرپای بکات ئەوە فەرمانی ئایینی بەجێهێناوە، هەر کەسێك پشتگوێی بکات ئەوا فەرمانی ئایینەکەی پشتگوێ خستووە.

**جیاوازیش هەیە لە نێوان (إقامة الصلاة) و(أداء الصلاة)**

هەڵبەتە(اقامة الصلاة)بەرپاکردنی نوێژ جیاوازە لە (أداء الصلاة) بەجێهێنانی نوێژ هەموو موسڵمانێ کە نوێژکارە دەتوانێ نوێژ بەجێ بهێنێ یانی (أداء الصلاة) بکات، بەڵام هەموو کەسێ ناتوانێ نوێژ بەرپابکات یانی: (اقامة الصلاة)بکات، چونکە بەجێهێنان(اداء) شتێکەو بەرپاکردن(إقامة) شتێکی دیکەیە، خوای گەورە لە زۆر شوێندا لەقورئاندا(اقام و اقم و یقیمون)ەی بەکارهێناوە وەکو دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿٥٥﴾ ﴾ المائدة، ﴿ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾ ﴾ التوبة، زۆر ئایەتی دیکە هەیە لەم بارەوە، جا دەبینین تەنانەت یەك جاریش نەیفەرمووە (أداء الصلاة)نوێژ بەجێدەهێنن یان نوێژیان بەجێهێنا، چونکە خوای گەورە نوێژی بێ



ڕۆحی ناویێ، وە (اداء الصلاة )بەجێهێنانی نوێژ واتا نوێژێك هەموو ئەرکانەکانی تێدابێت.
بەڵام (إقامة الصلاة)بەرپاکردنی نوێژە (سەربارەی ئەرکانەکان کە لە(اداء الصلاة) هەیە) دەبێت خشوع و ملکەچی تێدابێت و نوێژەکەش لە خراپەش بیگێڕێتەوە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾﴾ العنکبوت.
بەکورتی: نوێژ بەرپاکردن هەموو ئەو شتانەی تێدا دەکرێت و ئەنجام دەدرێت کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆنی کردووەو چۆن ڕەنگی داوەتەوە لە هاوەڵانی(ڕەزای خوایان لێبێ) ئەوە(إقامة) بەرپاکردنە، بەڵام بەجێهێنان و ئەدا کردن ئەوەیە هەر ئەرکانەکان جێبەجێ بکەی و ملکەچی و خشوعی لەگەڵ نەبێت و لەخراپە نەیگێڕێتەوە، وەکو دەڵێن: هەر لەناو خەڵك ببێژن فولانە بابا نوێژکەرەو تەواو.
سێیەم: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾: یانی بەشێ لەوماڵەی لە دەستیانە و خوای گەورە پێی بەخشیون لەڕێگای ئەودا دەیبەخشن، جا بەخشین چ ئەوەی کە واجبە وەکو:زەکات، کە مەرجی خۆی هەیە بۆ ئەو شتانەی کە دیاری کراوەو بەسەر چەند جۆرێ لەخەڵکی دابەشدەکرێ، چ وەکو بەخشینی سوننەت و صەدەقە، کە ئەمەش هەندێ لە زانایان دەڵێن: بەدەر لە زەکات صەدەقە و خێریش واجبە ئەگەر کەسێك ماڵی هەبێت بەتایبەت موسڵمانان پەکیان لەسەرکەوتبێ ئەمەش کۆدەنگی زانایانی لەسەرە، وەکو ئیمام مالیك دەربارەی ئەوەی ئەگەر دیل گیرابوو فەرزە لەسەرخەڵکی کە سامانی بۆ کۆبکەنەوەو دەڵێ: ئەمە ئیجماعی لەسەرە، وە ئیبنوحەزمیش دەڵێ: لەسەر خواپێداوان فەرزە کە خەمی هە بخۆن.
بەخشین چەمکێکی زۆر فراو پایەی خۆی هەیە لەئیس واجبەکەی لەدوای نوێژدا لەزۆربەی ئایەتەکان، کەخ دەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟﴾ ، وە دەربارەی خێر و صەدەقە فەرمودە هاتوون، وەکو وتمان صەدەقە هەر لەماڵ دەرناکرێ بەڵکو لە شتانی دیکەش دەدرێ.
وە زانایان دوو ڕایان هەیە دەربارەی بەخشین کە لەم ئایەتە هاتووە:
وتراوە: مەبەست لێی زەکاتی واجبە، لە ئیبنو عەباس هاتووە دەڵێ: بەراوردکراوە بەرامبەر بەنوێژ.
وە وتراوە: بەخشینی پیاو بۆ ماڵ و منداڵیەتی، لەبەر ئەوەی باشترین بەخشینە، کە لە ئیبنو مەسعودەوە گێڕدراوەتەوە.

## چەند زانیارێ

وشەی: (غیب)(٤٨)جار لە قورئان هاتوو.
وشەی: (الصلاة) لەقورئاندا(٥٨)یا(٦٧) جار هاتووە.
وشەی (الزکاة) نزیکەی(٣٢)جارو وشەی بەخشین(نفق ونفقە)بەهەموو شێوەکانیەوە، نزیکەی(٧٣)جار لەقورئاندا هاتووە.
وشەی(رزق، رزقا، رزقناکم... هتد)بەهەموو صیغەکانیەوە نزیکەی(٩٦)جار هاتووە.

## ڕڤەی چەند وشەیەك

١-(يُؤْمِنُونَ) یانی: (یصدقون بما اخبر به النبي(ﷺ) من امور الآخرة)بەڕاستزانینی ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داوە دەربارەی دوارۆژ.
وە ئەم وشەیە لە بنچینەدا لە (الامن) هاتووە کە بەمانای ئاسوودەیی دەروون و ئەمانی ترسە.

(بِٱلْغَيْبِ) غەیب: ... شتێکە شاراوەبێت
... وان، ئەو شتەی کە لەزانستی
... شاراودیە، وەکو: خوای گەورەو
... ی و مردن و ژیانی بەرزەخ و
... وەو ڕۆژی دوایی و بەهەشت و
... تی پەنهانن.

... ) هەڵسانە بەکارێك بە شێوەیەکی
تەواو ... پێك پێیی و لەکاتی خۆیدا،
... ێزگاری کردن لێی، بەردەوام بوونیش
لەسەری، (إقامة)ش دوو جۆرە: یان ئەوە بەهەڵبژاردنی کەسەکە خۆیەتی: وەکو: شەونوێژ یاخود ئەوەیە لەدەستەخۆیدانیە، ئەو شتانەی کەفەرزە لەسەر مرۆڤی موسڵمان پێویستە هەڵسێ ئیقامەی بکات و پێوەی پابەندبێت.

٤-(ٱلصَّلَوٰةَ) لەزماندا هەندێ واتایان لەخۆدەگرێ، باوەکەی واتا: الدعاء: پاڕانەوە، بەڵام لەزاراوەدا یانی: (اقوالٌ وافعالٌ مُفتَتَحةٌ بالتكبير مُختَتَمة بالتسليم، بشرائط مخصوصة)واتا: کۆمەڵێ قسەو کردارە بە(الله اكبر) دەست پێدەکات و بە سەلامدانەوەش بە دوماهی دێت، بەچەند مەرجێکی تایبەت بە نوێژەوە.

٥-(رَزَقْنَٰهُمْ)لەزماندا بەواتا: (عطاء والزاد) بەخشین و زیادکردن دێت، یاخود دەوترێ: (رزق فلانا)یانی سوپاسی فلانی کرد، لە زاراوەی شەرعدا: رزق هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە خوای گەورە دەیبەخشێ چ ئەوەی بەهۆی بارانەوە لەزەویدا دێتەدەرو چ هەموو ئەو شتانەی کەمرۆڤ سودی لێدەبینێ.

٦-(يُنفِقُونَ) بەخشین: یانی شتێکە تێپەڕی و ڕۆیشت، جا ئەو ڕۆیشتن و دەرکردنە بە فرۆشتن بێت، یاخود ئەوەیە بەمردن بێ، یان بە وون بوونبێ، وەکو: بابایەك دەڵێ: چەند دینارێکم بەخشی، یانی: چەند دینارێکی لێ ڕۆیشت، وە(الإنفاق)بەخشین لەپارەیە یاخود لەشتی دیکەیە، لە زاراوەی شەرعیدا یانی: ( إخرج المال الطيِب في الطاعات والمبَاحات)واتا: دەرکردنی ماڵێکی چاك لە گوێڕایەڵیەکان (وەکو زەکاتی واجب)وە ڕەواییەکان(وەکو بەخشین وصەدەقە).

**ئەوەی لەو ئایەتە وەردەگیرێ**

١-بڕواو ئیمان کۆڵەگەی سەرەکی هاتنە نێو ئیسلامەتی و بوونە موسڵمانە هەر کەسێ ئیمانی نەبێ لە ئیمانداران هەژمارناکرێ.

٢-بابای موسڵمان تەنها بە بڕواهێنان نابێتە بڕوادار تاوەکو ئەوانەی ئیمان دەیخوازێ لەخۆی نەهێنێتەدی.

٣-بڕوابوون بە شتەنادیارەکان نیشانەی ئیمانەو بەپێچەوانەوە هەر کەسێ بڕوا نەهێنێ بەشتە پەنهانەکان دەردەچێ لە بازنەی ئیمان و ئیسلامەتی.

٤-نوێژ بەرپاکردن ئەویش یەکێکە لەو پێویستیانەی کەخوای گەورە واجبی کردووە، جاکاتێ کەسێ وازدەهێنێ لە نوێژ یانی بەشێکی ئیمانی لەدەستداوە.

٥-زۆربەی زانایان دەڵێن: کەسێك نوێژ بەرپانەکات بە ئانقەست لە بازنەی ئیسلامەتی دەچێتەدەر، چ جای باوەڕ پێ نەبوونی.

٦-بەخشین بەهەر دوو واتاوە چ زەکات چ لە حاڵی ئاسایی، نیشانەیەکی ئیمان و پارێزکارییە.

٧-هەندێ لەزانایان بەخشینی حاڵەتی ئاسایی، یانی جگە لە زەکات کە مەرجی خۆی هەیە، بە ئەندازەی پێویست بە واجبی دادەنێن و بەڵگەشیان لەدەستە.

٨-هەر کەسێ خۆی لە دەستەی بڕواداران هەژمار بکات دەبێت باوەڕی بەخواو بە شتە پەنهانەکان و نوێژ بەرپابکات و لەو ڕزق و ماڵەی پێی بەخشراوە بیبەخشێ.

سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ
وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ

# زانستی فەرموودە
## علم الحدیث

ئا: پاداشت- زنجیرەی یەكەم

بەناوی خودا

ئێمە وەكو ستاف بۆ هەموو ژمارەیەك هەڵدەستین بە ڕوونكردنەوە و ناساندن و پێناسەكردنی زاراوەكانی ئەم زانستە، كە بەڕاستی ئەو زانستە پلە و گرنگی خۆی هەیە بۆ تاكی موسڵمان، هیوادارین سوود و كەڵك بەخشبێت.

**پێناسەی زانستی فەرموودە**

(علم الحدیث)

بریتیە لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە لێكۆڵینەوەی فەرمودەوە هەیە، لەڕووی ناسینی پیاو (الرجال)و مێژوو و پلەبەندی فەرمودەكان.

**پێناسەی زاروەكانی فەرموودە**(مصطلح الحدیث)

زانستێكە كە بەهۆی چەند بنەماو ڕێسایەكەوە حاڵەی ڕشتە(السند) و دەق (المتن) دەزانرێ، لەڕووی وەرگرتنی فەرمودە یاخود وەرنەگرتن و ڕەتكردنەوەی.

**پێناسەی فەرمودە**(الحدیث): بریتیە لە هەموو گوفتارو كردارو پەسندكراو و صیفەتێك كە دەدرێتە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ).

**پێناسەی ڕشتە**(السند): زنجیرەی ئەو پیاوانەیە كە دەقی فەرمودەكە دەگێڕنەوەو دەگەیەنن.

**پێناسەی دەق**(المتن)

ئەوەیە كە جگە لە سەنەدەكە دەمێنێتەوە، واتە: تەنها دەقی فەرمودەكەیە.

**زانستی گێڕانەوەی فەرموودە**

بریتیە لەو زانستەی كە باس لە گێڕانەوەو چۆنیەتی خوێندنەوەو نوسینەوەی فەرمودە دەكات



**زانستی پێزانینی فەرموودە**

بریتیە لە كۆمەڵە ڕێسایەك كە بەهۆیانەوە ئەحواڵی دەقی فەرموودەو ڕشتەی گێڕانەوەكەی دەزانرێت.

**بەرهەمی فەرمودەناسی**

بریتیە لە جیاكردنەوەی فەرمودەی ڕاست (صحیح) لە فەرمودەی نا ڕاست(السقیم).

# لەخزمەت فەرموودەدا

زنجیرەی: چوارەم

بەناوی خوا. لەم زنجیرەدا دەچینە خزمەت ئەم فەرموودە کەهاتووە، عن تميم الداري رضي الله عنه إن النبي (ﷺ) قال: «الدِّينُ النَّصِيحَةُ» قُلْنَا لِمَنْ؟ قَالَ: »، وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ ولأئِمَّةِ المسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ«أخرجة مسلم(٥٥)

واتە: (ئایین دڵسۆزی و نیاز پاکیە، ئێمەش گوتمان بەرامبەر کێ؟ فەرمووی: دڵسۆزی بۆ خوداو کتێبەکەی و پێغەمبەرەکەی و پێشەوای موسڵمانان و موسڵمانان بەگشتی).

دین و ئیمان وا دەکات مرۆڤەکان هەموو ساتێ دڵپەیوەستبن بەیەگدی، بەو واتایەی ئەهلی ئیمان بۆ ئیمانداران لەخۆشی و ناخۆشیان ساتێ بێ ئەوان هەڵنەکەن، وە هێزێ لەو دینەدا هەڵقوڵابێ دەبێ ئیمانیش پاڵمان پێوەنێ بۆ ئەوەی بەرنجامی هەندێ شت هەیە هەڵیگێرینەوە.

دین و ئیمان وادەکات کە ئەو کەسە دڵسۆزبێ و ڕاست بکات لەگەڵ خوای کاربەجێ و لەگەڵ وتەی کتابەکەشی کەلەدوو توێی قورئانی مەزندا خۆی دەدۆزێتەوە، وە ئەو دڵسۆزیەشمان بۆ پێغەمبەری خواش(ﷺ) هەمان ڕاستی پێوەدیار بێ کە لەسوننەتەکانی بەرجەستەیە، وە جگە لەوەش دەبێ دڵسۆزیمان و خەمهەڵگرتنمان بۆ برای ئیمانداربێ و بەرتەسکی نەکەینەوە لەخزم و عەشیرەت، بەڵکو بۆ هەموو موسڵمانان هەمان پێوەری هەبێ، دەبینی برایەکی موسڵمانت کارێکی نەشیاو ئەنجام دەدات پێویستە دڵسۆزانە بەرەو پیلی بچیت و ئامۆژگاری بکەیت و دڵسۆزی خۆتی بۆ نیشان بدەیت و ئەوەی لەسەر لابەی کە تووشی بووە، جا کاتێ ئاوامان کرد ئەوە دڵسۆزیمان دڵسۆزییەکە بەهۆکاری ئیمانەوە شوێن و پێگەی خۆی داکوتاوەو دامەزراوەو هیچ شتێ نامێنێ بۆ چاکە دڵسۆزی بەردەوامی دەبێت و لەخراپەشدا دڵسۆزی دەردەبڕی بەوەی واز بێنێ و ڕزگاری بکەیت لەو کارە نەشیاوە، بۆ ئەوەی ئەویش ئەگەر لادانێکی هەیە بیگێڕێتەوەو بۆت چاربکا و بیهێنێتە ڕیزی دڵسۆزانەوە.

کەواتە بوونی گۆڕانکاری و ئامۆژگاری و دڵسۆزی نواندن هەقیقەتێکی ئیمانیەو نیشانەیەکە ئیمانداران پێوە دەناسرێت.

بەکورتی ئەوەی لەم فەرمودەی وەردەگرین ئەوانەیە:

١- ئایین دڵسۆزییە، و دوو شتی پێکەوە گرێدراون، وەکو لە صەحیحی بوخاری هاتووە: ( عن جرير بن عبد الله - رضي

الله عنه - قال ":بايعتُ رسول الله (ﷺ)على إقام الصلاة، وإيتاء الزكاة، والنصح لكل مسلم" ).




واتا: پەیمانم دەگەڵ پێغەمبەرێ (ﷺ)بەست لەسەر نوێژبەرپاکردن و زەکات دانێ، وە دڵسۆزی نواندن بۆ هەموو موسڵمانێ.

٢-دڵسۆزی بۆ خوا(جل جلاله)نواندن، یانی: بڕوای پێبینی و پابەند بیت بەسەرجەمی ئەو شتانەی کەفەرمانی پێ کردووەو دووربکەویتەوە لەسەرجەمی ئەوانەی کە ڕێگری و حەرامی کردووە.

٣-دڵسۆزی نواندن بۆ پێغەمبەر(ﷺ) یانی: خۆشویستن و گوێڕایەڵیکردن و زیندوکردنەوەی سوننەتەکانی و دووركەوتنەوە لەهەموو شتێ کە ... ئەنجامی نەداوە.

٤-دڵسۆزی بۆ کتاب... ئەم قورئانە بکرێتە بە... خوێندنەوەو تێگەیشت... و وردبوونەوە ل... لەحۆرەسگدان... بانگەوازپێکردنی.

٥-دڵسۆزی بۆ پێشە... موسڵمانان، چ لە حوکمڕانی چ وەکو زانایانی بەرێز، دەبێت بەڕێزەوە بەرامبەریان هەڵسوکەوت بکەین، بەتایبەت زانایانی دڵسۆز دەبێت لەئاستیاندا بە ... مامەڵەبکەین.

٦-دڵسۆزی بۆ هەموو موسڵمانان: ئەمەش ئەوەیە هەر کاتێ کەسێ داوای ئامۆژگاری کرد بەدڵسۆزیەوە بەرەو داواکەی بچین، کەسێ داواش نەکات بانگەوازیکەین و پێمان ناخۆشبێت خەڵکی لەنێو سەرپێچی و تاواندا بتلێنەوە، ئەمەبوو کورتەیەک دەربارەی ئەم فەرموودە.

# ئیسلام یەك ئاینە و یەك ئاڵاشە

ڕێناز جەمال

هەرچی ئەم ئیسلامە فەرمانی پێکردووە دەبێ لە ژێر ئەو تاکە ئاڵایەیدا بخرێتە مەیدانی کار و خەبات، نەوەك هەر یەك لەوانەی ئیسلام فەرمانی پێداوە بە پەرشوبڵاوی و لەیەکترازانی فیکری و عەقیدەیی بگەیەنرێتە ئامانج، چونکە زەمینەی کار لەژێر یەکە ئاڵا و درووشم هەڵکردنی تەواویەتی فەرمانەکانە بە پێشەوایەتی پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم).

ئیسلام یەك ئاڵای هەیە و ئاڵاکەش تاکە دورشمکی لێنوسراوە و دەبێ هەموو ئەو شتانەی کە فەرمانی ئیسلامەتیە بۆ بەندە گوێڕایەڵەکانی خوای گەورە لەژێر ئەو تاکە ئاڵایەدا بەئەنجام بگەیەنرێ، هەڵبەتە تەواویەتی ئیسلام لە چێریدا دەبێت بەجێبگەیەنرێت نەوەك واز لەهەندێکی بهێنرێت و هەندێکی جێبەجێبکرێت، بێگومان مایەی قەبوڵ کردن نییە لای خوای گەورە هەتاوەکو هەموو ئیسلامەکە لە ژێر ئەو ئاڵایەدا جێبەجێ نەکرێت.

وازهێنان لەبەشێك لە ... فیکر واتا داڕووخان و ڕمانی ئاڵا، دەستگرتن بە بەشێك لە ئاین و دەست بەردان و پەراوێزخستنی بەشەکەی تری یانی ڕووخان و ڕمانی تاکە ئاڵا، هەر کاتێکیش تاکە ئاڵا ڕما بەندەگیەکانی ژێر ئاڵا بوونی هەقیقیان لەدەست دەدەن.

تەواویەتی ئەوەیە: ئاڵا لەژێر سێبەری ئاینی تەواو دێتە بوون، پاراستنی ئاڵاش بەدەستگرتنێکی تەواو بە ئاینەوە دەبێت، دەستگرتنێك کە هەموو کونلەبەرەکانی بگرێتەوە.

# فیقهی ئیسلامی

## زنجیرەی چوارەم

بەناوی خوا، لەزنجیرەی ڕابردوودا باسی پیسیەکانی ئاژەلانمان کرد، ئێستاش دێینە سەر باسی خۆشۆردن:

**خۆشۆردن( الغسل )**: بریتیە لە خۆپاکردنەوە بە ئاوێکی پاك و پاککەرەوە، وەگەیاندنی بەهەموو بەشەکانی لاشە، بەبەڵگەی ئەو ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا ﴾ (٦) المائدة.

واتە: (وە ئەگەر ئێوە لەشتان پیس بوو (بەجەنابەت بوون)ئەوا خۆتان پاك بکەنەوە).

**هۆکارەکانی واجب بوونی خۆشۆردن**

ئەگەر هاتوو مرۆڤ یەکێك لەو هۆکارانەی لێهاتەدی خۆشۆردنی دەکەوێتە سەر:

**یەکەم : هاتنەوەی مەنی**: ئەگەر کەسێکە بە لەزەت و شەهەوەتەوە ئەو ئاوەبێتەوە، یاخود لەخەودا بێت و کاتی هەڵسا ، ئاوەکەی بینی، یان لەکاتی بەیەککەیشتنی هەر دوو ڕەگەز، یاخود یەکێك لەوان(کوڕ و کوڕ، کچ و کچ) ئەوا مادام ئاوی بینی لەو کاتە خۆشۆردنی واجبی دەکەوێتە سەر، بەبەڵگەی ئەوەی(ﷺ دەفەرموێت: (الماء من الماء)اخرجه مسلم.واتە: ئاو هاتنەوە ئاوی لەسەرە(خۆشۆردنی لەسەرە).

**دووەم : جووت بوون( الجماع)**: هەر کاتێ پیاوو ئافرەت بەیەککەیشتن ئەوا خۆشۆردنی واجبیان دەکەوێتە سەر، بەبەڵگەی ((ﷺ دەفەرموێت: (إذا قعد بين شعبها الأربع ثم مسّ الختانُ الختانَ فقد وجب الغسل) اخرجه احمد ومسلم و الترمذي.

واتە: (ئەگەر پیاو لەنێوان چواری (دوو دەست و دوو لاق)ی ژندا دانیشت و پاشان چوونەژوو(دخول)ڕوویدا ئەوە خۆ شۆردنی واجبی دەکەوێتەسەر).

**سێیەم : وەستانی خوێنی حەیزو نیفاس**: کاتێك ئافرەت ئەم دوو خوێنەی وەستا، خۆشۆردنی واجبی دەکەوێتە سەر، بەبەڵگەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴾ (٢٢٢) البقرة.

واتە: ("کاتێك ئافرەتان کە لەحاڵەتی حەیزدان"نزیکیان مەکەون تاوەکو پاك دەبنەوە).

**چوارەم: شۆردنی مردوو**: ئەگەر هاتوو موسڵمانێك مرد، لەسەر موسڵمانان واجبە بیشۆرن، بەبەڵگەی ﷺدەفەرموێت: (إغسلوة بِمارد وسدر) متفق عليه.

واتە: ("مردوەکانتان" بە ئاو و سابوون بیشۆرن).

**پێنجەم : موسڵمان بوونی بێ باوەڕ**: ئەگەر کەسێکی بێ باوەڕ موسڵمان بوو واجبە خۆی بشۆرێت، بەبەڵگەی( ﷺدەفەرموێت: (أن يغتسل بماء وسدر)اخرجه البخاري و مسلم.

واتە:(با خۆی بشۆرێت بە ئاو و سابون).

# بەرزترین خورەوشت

ن: مەلا نەوزاد شەرمبوتی

بەرزترین خوورەوشت
خــودای گــەورە دەربــارەی دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم.

واتــە: بــەڕاسـتـی تــۆ لــەســەر خوورەوشتێکی زۆرجوان و پەسەند و بێ وێنەو مەزنی.

سوێندێکی گەورە لە لایەن خوایەکی بەخشـنـدە و مـیـهـرەبـان لـەسـەر هەڵبژێردراوێکی خاوەن ڕەوشتێکی گەورە، هەروەها خوای گەورە لە زۆر شوێنانی تر مەدحی ئەم پێغەمبەرەی کردووە مرۆڤایەتی و بەتایبەت بۆ موسڵمانان تا ئێمەش سوودمەند بین لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئەم زاتە. خوا فەرموویەتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران.

کەوابوو ئەی (محمد صلی الله علیە وسلم) بەهۆی ڕەحمەتی خوایەوە تۆ نەرم و هێمن بوویت لەگەڵیاندا خۆ ئەگەر توورە و قسە ڕەق و بێ بەزەیی بوویتایە ئەوا هەموو لەدەورت بڵاویان دەکرد، هەروەکو گوێبیستی ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەرﷺ دەبێ ئێمەی موسڵمانان پێویستە لە ژیانی ڕۆژانەماندا پەیڕەویان بکەین، خاتوو عائیشە دایکی ئیمانداران(رضي الله عنها) وەسفی پێغەمبەرمان بۆ دەکات کاتێك هاشمی کوری عامر پرسیاری لە خاتوو عائیشە کر وتی: هەواڵم بدێ وە ئاگادارم بکەوە لە ڕەوشتی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیە وسلم)، عائیشە فەرمووی: ئایا تۆ قورئان دەخوێنی، هاشم وتی: بەڵێ دەخوێنم، خاتوو عائیشە وتی: (فإن خلق نبی(صلی الله علیە وسلم) كان القرآن). خوورەوشتی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیە وسلم) قورئان بووە. وە هەروەها ئەنەسی کوری مالیك(رضي الله عنه)(كان رسول الله احسن الناس خلقا)، لەنێوان خەڵك پێغەمبەری خودا(صلی الله علیە وسلم) بەڕەوشت ترین کەس بووە، وە پێغەمبەری خودا لەفەرموودەیەکی کراوە دەفەرموێت: (إنما بعثت لمكارم الاخلاق) من نێردراوم بۆ تەواوکردنی ڕەوشتە بەرز و جوانەکان.

# ئێمەی موسڵمان چیمان بۆ زانست کردووە؟

بوخاری عبدالله قەسری

مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت ئەرکی سەرشانی کە ئاوەدانکاری و چەسپاندنی دادگەری و بەندایەتی خوای گەورەیە بهێنێتە دی ئەگەر چاوو هۆشی ڕۆشن نەبێت بە زانست و مەعریفە. چونکە مرۆڤی نەزان نەك هەر چاوەڕێی خێرو بێری لێ ناکرێت بەڵکو بۆ خودی خۆیشی مایەی دەردو بەلآیە، وەکو فارس لە پەندێك دا دەڵێن: مرۆڤی نەزان دوژمنی خۆیەتی، جا چۆن دەکرێ دۆستایەتی بکەین. لەبەر ئەوە زانست چرایەو ڕێگای گەیشتن بە مرادو مەبەست بۆ هەموولایەك ڕۆشن دەکاتەوە، هەربۆیە هەر نەتەوەیەك پشتی کرد لە داواکردنی زانست و گەڕان بەدوای دا ئەوا کەوتۆتە چاڵێکی تاریکەوەو، بڕیاری مەرگێکی بە هێواشی داوە. لەبەر ئەم خاڵە گرینگەیە کە خوای پەروەردگار (سبحانە وتعالی) و پێغەمبەری مەزن (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتە پیرۆزەکانیاندا جەختێکی یەکجار زۆریان کردۆتەوە لەسەر پیرۆزیی زانست و داواکردنی، کە ئێمەی مسوڵمان گوێبیستی زۆرێك لەو فەرمایشتانە بووین، لێ حەیف زۆر بەکەمی بەهەندمان زانیون. ئەوەندە بەسە لەسەر گەورەیی فەزڵی زانستخوازو زانستدۆستان دا کە پێغەمبەری پێشەوا ئەفەرموێت: (تستغفر له حیتان البحر و طیور السماء حتی النملة)، واتە: نەهەنگەکانی دەریا و باڵندەکانی ئاسمان و تەنانەت مێرووڵەکانیش داوای لێخۆش بوونی بۆ لە خوا ئەکەن.



هەڵبەتە زۆرێك لە مسوڵمانان لە خاڵێکدا بە هەڵەدا چوون، وا حاڵیی بوون کە مەبەست لە گەورەیی زانست تەنها زانستە فیقهی و ئیسلامیەکانە.. کە لە ڕاستیدا ئەمە هەڵەیەکی کوشندەیە، هەر ئەوەشە هۆکاری ئەو دواکەوتنە ژیاریەی کە مسوڵمانان لە

زۆرینەی وڵاتانی ئیسلامی تێیدا ئەژین، تا ئەو ئەندازەیەی کە بە وڵاتانی (نامی) و جیهانی سێیەم ناو دەبرێن. لەڕاستیدا ئەم تێگەیشتنەی هەندێ لە مسوڵمانان بۆ چەمکی (زانست) زۆر کرچ و کاڵ و نا لۆژیکی یە، چونکە زانست بە هەموو لق و پۆپ و بەشە جیاوازیەکانیەوە خزمەتێکی مەزن پێشکەش بە ژیانی مرۆڤ بەگشتی و مسوڵمانان دەکات، بەتایبەت لە هەل و مەرج و بارودۆخێکی وەکو ئەمڕۆ کە بەهێزترین چەك لە جیهاندا بریتییە لە زانست و تەکنەلۆژیاو شۆڕشی زانیاری و کۆمپیوتەریەکان..، جا بە خۆ دوور گرتن لەو زانستە بەرفراوانە ئێمەی مسوڵمان چەندین هەنگاو لە کێبڕکێ کردنی وڵاتانی ڕۆژئاوا وەپاش دەکەوین، بە چەکێکی لاوازو بە مەنتیقێکی نا ستراتیژیەوە ڕووبەڕوویان دەوەستین! هەموشمان ئەو ڕاستییە دەزانین کە وڵاتانی ئیسلامی هەر لە دەرزیەکەوە تاکو فڕۆکەو کەشتی و شەمەندەفەرو...هتد هەمووی لە وڵاتانی بێباوەڕ هاوردە دەکەن. ئێمەی مسوڵمان لە سایەی سیستمی سەرمایەدارییەوە خۆمان کردووە بە سەنتەری ساغکردنەوەی کاڵا بازرگانی و پیشەسازییەکانی ئەوان، بووین بە بەشێك لە پلانە ئابووریەکانیان، جا ئەگەر جارجاریش سوکایەتی بە ... بکەن ئەوا • ... چەند خۆ ... ڕووکەشی و ع. ... ناتوانین لەبەر دابڕانێکی ئـ. ... ڕابگەیەنین و بڕیا، هیچ کاڵایەکی ئەوار نەکەین، چونک دڵنیاییەوە دووچار شکست و دارمانی ئابوو ی دێین و، ناتوانین پشت بە خۆمان ببەستین، چونکە خاوەنی عەقڵی زانست و تەکنەلۆژی نین و هێشتا زۆرمان ماوە بگەینە ئەو قۆناغە.

**زۆرێك لە مسوڵمانان لە خاڵێکدا بە هەڵەدا چوون وا حاڵی بوون کە مەبەست لە گەورەیی زانست تەنها زانستە فیقهی و ئیسلامیەکانە**

بەهەر حاڵ. پوختەی قسانم ئەوەیە کە ئەرکی سەرشانی لاوانمانە کە بە پەرۆش و دڵسۆزییەوە چاو لە واقیعی کۆمەڵگای ئیسلامی بکەن و. تەمەنی پیرۆزیان لە خزمەتی زانست و زانیاری دا بەسەر بەرن. سا بەڵکو ببنەوە خاوەنی ئەو پێشکەوتنە شارستانییە زێڕینەی کە کاتی خۆی مسوڵمانان لە جیهاندا ڕابەرایەتییان دەکرد، ئەو پێشکەوتنەی کە لە جیهان دا وێنەی نەبوو. وەکو زانای بەناوبانگ (ویل دیورانت) لەوبارەوە وتویەتی: (إنها کانت اقوی حضارة علمیة)، واتە: ژیاری ئیسلامی بەهێزترین ژیاری زانستی بوو.



# تاقیکردنەوەی خوا بۆ مرۆڤەکان چییەو چۆنە؟

باوکی عومەر- ب: یەکەم

تاقیکردنەوەو ئیمتحانی خوای گەورە بۆ بەندەکانی شتێکە هەموو مرۆڤەکان تێیدا بەشدارن و بەسەر هەمووانـدا ڕاگەیشتووە، بەڵام پلە پلەی لە نێوانیاندا هەیـە، بەچەشـنێ هەیـە زیاتـر تاقیدەکرێتـەوەو هەیـشە کـەمتر، بـەدەربڕینێکی تـر هەیـە پلـەی تاقیکرانەوەکـەی بـەهێزترە لەلایەنـی مـاددی و مەعنەویـداو نارەحەتیـەکان بەسوێ ترن، لەبەرامبـەردا خوای گەورە بۆ ئەوانەی کە بڕوادارن ئەوا پاداشتیان زیاتر بە چاکە دەداتـەوەو ئەوانەیشی کە بێ باوەڕن ئەوا حیسابیان دیارە.

بەڕاستی ژیان و مردن شتێکە لەدەستی خوای گەورەدایە، جا لەژیاندا مرۆڤەکان تاقیدەکرێنـەوە بۆ ئەوەی چاك و خراپ لێك جیابکرێ و بۆ بڕوادارێش تاوەکو چاکترین کردەوە ئەنجام بدات، بۆ وێنـە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾ الملك

واتە: (هەر خۆی (خوا) مردن و ژیانـی بەدی هێناوە، تا تاقیتانبکاتـەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەنترە، هـەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە بەسـەر بێ باوەڕانـدا وە لێخۆشبووە لە ئیمانداران).

تاقیکردنـەوەی خوا(جـل جلالە)بەچـەند شێوەیەك دەبێـت. کـە لـەم ئایەتـەدا چەند شتێ باسکراوە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾﴾ البقرة

واتـە: (سوێند بەخوا تاقیتـان دەکەینـەوە بەکـەمێك لـەترس و بیـم و برسێتی و کـەم بوونی ماڵ و سامان و مردنـی کـەس و کارو تیاچوونی بـەروبوومی کشتوکاڵ، جا مـژدە بدە بەو کەسانەی خۆگرو ئارامگرن).

جا بـەکورتی سـەرنجێ لـەم ئایەتـە بدەیـن دەبینـین، چـەند شـتێکی باسـکردووە کـە هۆکاری تاقیکرانەوەن بۆ مرۆڤەکان لەوانە:

یەکەم: (ٱلْخَوْفِ ):ترسان و لەنێو بیمدابوون، ئـەم ترسـانەش چ لەلایـەنی ئەهلـی کوفرەوەبێت بۆ سەر موسڵمانان، یا کەسانێ لەکەسـانێکی دیکـە بترسـن و لەئاسـتیدا چۆکاندابێنن، کەواتـە یەکـەم شت کەمرۆڤی پێتاقیدەکرێ وەکو لە ئایەتەکە دیارە باسی ترسە.

دووەم: ﴿وَٱلْجُوعِ﴾: برسیکردن و تونێنیکردن، کەدیارە ئەمەش هەم لایەنی هەژاری دەگرێتەوە هەمیش ئابلۆقەخستنەسەر، وەکو ئەوەی لە شیوی ئەبوتالیب کە لە دۆڵەکەدا ئابلۆقەیان خرابوۆوە سەر، بۆیە بابای موسڵمان بەم شێوە تاقیدەکرێتەوە بەلێگرتنەوەو نانبڕان و برسیکردن.

سێیەم: ﴿وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ﴾: لەدەستدان و رۆیشتنی ماڵ و سەروەت و سامان و ئەوەی ساڵانێ کۆکراوەتەوە دەبینی لە پڕێکا ئاتاری بەسەر باتاری نامێنێ و لەدەستی دەدات، کە نمونەی ئەم جۆرە لەدونیای واقیعماندا زۆرە.

چوارەم: ﴿وَٱلْأَنفُسِ﴾: ئەمەش جۆرێکی دیکەی تاقیکرانەوەی مرۆڤەکانە کە کەس وکارو دۆستانی دەستدەدات و دەگەڕێنەوە لای خوا. جا یا بەمردن دەبێت، یاخود بەهۆی دورکەوتنەوەو زۆر شتیتر لەم بابەتە.

پێنجەم: ﴿وَٱلثَّمَرَٰتِ﴾: وە لەدەستدانی بەرووبوم و ئەو شتانەی لە پاژنەی کشتوکاڵیدا لە دەستانی دەچێ. جا بەهۆی نەبارینەوەبێت یاخود لافاو یاخود تینی گەرماو پەیدابوونی جۆرە گیانداری نەخۆشیلێدان لە بەرهەمەکەبێت، بەهەر هۆکارێ بێت گرنگ کاتێ ئەمە لەدەستان دەدات ئەوا تاقیکردنەوەی خوایە بۆ بەندەکانی.

لە کۆتاییدا﴿وَبَشِّرِ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ موژدە بۆ کەسانێکە کە باوەڕدارن و ئارامگرن لەسەر تاقیکردنەوەی خوا. ئەوەی دێت بەسەریان هەموو لەخواوە‌[illegible]زانن و [illegible] فەرمانی ئەو هیچ کەس ناتو[illegible] [illegible] سوود بگەیەنێ.




زۆر جۆر تاقیکردنەوەی دیکە هەیە، کە ئێمە دەرفەت لوا لە ئالقەکانی تر باسیان دەکەین، بەپوختی دەڵێین: ئەم تاقیکردنەوەیە بۆ ئەوەیە خوای مەزن ئەهلی کوفر و ئیمان جیابکاتەوە، لەنێو ئەهلی ئیسلامیش موسڵمانی تەواو و دووڕوو و مونافیق جیابکاتەوە، کەواتە وەکو چۆن ئاگر زێڕی پاك لە مەعدەنی پیس پاك دەکاتەوە ئاواش تاقیکردنەوەی خوا بۆ بابای موسڵمانی پابەند لە کەسانی دیکە جیادەکاتەوە. با ئەوەش بزانین هەر شتێ کە دێت هەمووی بە فەرمانی خوایەو بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانیەتی و پێویستە ئێمە ئارامگربین و خۆمان لەدەست نەدەین کاتێ دەکەوینە نێو بەڵاو موسیبەتێك، لە کۆتادا ئەم فەرموودە بەیان دەکەین، کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرموێ، هەر کەسێ خوا ویستی خێری پێ بێت ئەوا توشی ناڕەحەتی و تاقیکرانەوەی دەکات، دەقەی فەرمودەکە: (من يرد الله به خيراً يصب منه) اخرجه البخاري.

# نیشانەکانی دوارۆژ (قیامەت) چین؟

عەبدوڵلا-بەشی یەکەم

بێگومان رۆژی دوایی شتێکی حەتمیەو هەردێت، جا مرۆڤ لەدەستی خۆی نیە بەوەی بیەوێ و نەیەوێ دەبێ ئەم رۆژە ببینێ، وە بەر لەهەمووان زیندوبکرێنەوە لەمەیدانی لێپرسینەوە ئەوا ژیانی دونیا هەیەو مرۆڤەکان کارو کردەوەی تێدا ئەنجام دەدەن، کە ژیانێکی کاتیەو دەبڕێتەوە. جا ئەوەی گرنگە لەم زنجیرەیەدا باسی بکەین چەند نیشانەیەك هەیە کە لە قورئان وسوننەت باسکراوە نێمە هەر ئالقەو نیشانەیەك یاخود چەند نیشانەیەك باس دەکەین بەپشتوانی خودای گەورە.

بەر لەوەی باسی نیشانەکان بکەین بۆ ئەم ژمارەیە بەکورتی باسی خۆ ئامادەکردن دەکەین، ئەویش بەوە دەبێت کە گورج و گۆڵ بین و بەدڵسۆزیەوە هەڵسین بە ئەنجامدانی پەرستشەکان، بەر لەوەی قیامەت و دوارۆژمان بەسەردابێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (إغتنم خمسا قبل خمس: شبابك قبل هرمك، صحتك قبل سقمك، وغناك قبل فقرك، وفراغَك قبل شُغلك، حياتك قبل موتك) صححه الالباني.

واتە: (پێنج شت پێش پێنجان بە غەنیمەت بزانە: گەنجیت پێش پیریت، لەشساغیت پێش ناساغیت، دەوڵەمەندی پێش هەژاریت، دەست بەتاڵیت بەر دەستگیرو کار، ژیانت پێش مردنت).

وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: (حَاسِبُوا أَنْفُسَكُمْ قَبْلَ أَنْ تُحَاسَبُوا)اخرجه الترمذي-بسند صحيح.

واتە: (لێپرسینەوەی نەفستان بکەن پێش ئەوەی لێتانبپرسرێتەوە).

لەم دیدگەوە هەموو موسڵمانێك پێویستە بۆ تەنها ساتێکیش بێت هەڵوەستە بکات و بوەستێ و لە نەفسی خۆی بپرسێتەوە داخوا چی لە هەگبەدایە؟ چی کردووە و چەند کەسێکی بۆ خوا دابڕاوە، بۆ خوا صولحاوە؟ یاخود یاخی و سەرپێچیکارە؟ جا کە پێچەوانەی کرد دەزانێ کە مردن و قیامەت و حیساب هەیە، مرۆڤی ژیریش ئەوەیە موحاسەبەی نەفسی دەکات لەدونیادا تاوەکو لە دوارۆژدا موحاسەبەی سوك بێت، بەهەرحاڵ با یەکدەست قۆڵهەڵماڵین بۆ ئەوەی خۆمان ئامادەکەین بۆ رۆژێك کە کەس وەهانای کەسەوە نایەت نە دایك وباوك بۆ منداڵانی و نەمناڵان بۆ ئەوان و نە برادەرو دراوسێ جگە لە کردەوە چاکەکانی، لە ئالقەی داهاتوو باسی نیشانەکان دەکەین کە تێپەڕیون.

# زانستی
# دایکی بڕواداران عائیشه(رەزای خوای لێبێ)
# ٢

م: ئەحمەد هەرکی

عوروەی کوری زوبێر دەڵێ: هیچ کەسم نەبینی بەقەد عائیشه(رەزای خودای لێبێت) لە شەرع و شیعر و زانستی پزیشکی، هەروەها دەڵێ: هاوڕێیەتی عائیشەم کردەوە کەسم نەبینیوە شارەزاتربێ بە ئایەتێك کە دابەزی بێ یان فەرزێك یان بە سوننەتێك یان بە شعر، وە هیچ کەسێ ئەوەندەی ئەو فەرموودەی نەگێڕاوەتەوە.

پێشەوا شەعبی دەڵێ: عائیشه(رەزای خودای لێبێت) وتویەتی(هەزار) دریژی شیعرم لە(لبید)ی شاعیر گێڕاوەتەوە.

پێشەوا زەهەبی دەڵێ: (مسند)ی عائیشه (رەزای خودای لێبێت) دەگەیشتە دووهەزار و دووسەد و دوو فەرموودە، وە کاتێ ئیبنو حەزم ناوی هاوەلانی باس دەکر ئەوانەی لە(ئەحکام و فەتوا) فەرموودەیان هەبوو پێش هەموویان ناوی عائیشەی هێنا و باسی دەکرد.

عەتائی کوری رەباح دەڵێ: عائیشه(رەزای خودای لێبێت) لەهەموو کەسێ شەرع زانتربوو.

مەسروق دەڵێ: لەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێکی پیرم بینی خەڵکی پرسیاری فیقهی و میراتیان لێی دەکرد، بێگومان ئەو ئافرەتەش دایکی ئیمانداران بوو.



پێشەوا زوهری دەڵێ: ئەگەر زانستی هەموو خەڵك و دایکانی ئیمانداران کۆبکەنەوە ئەوە بێگومان زانستی عائیشه(رەزای خودای لێبێت) لەهەموویان زیاترە.

بەڕاستی ئەگەریش بچینە خزمەت لایەنی تەقوا و پەرستشی دایکمان عائیشه(رەزای خودای لێبێت) وە باس لە دەست کراوەیی و بەخشین بکەین یاوەخودا ئاماژە بە بوێری و غیرەتی بکەین هەر تەواو نابێت.



# خۆتان بپارێزن لەو تاوانانەی کە مایەی تیاچوونن

ئا: دایکی ئیبراهیم

پێشەوا ئەبوبەکر(ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئایا پێتان بڵێم گەورەترین گوناە چییە؟ سێ جار لەسەر یەك ئاوای فەرموو. ئێمەش وتمان: فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پێمان بڵێ، فەرمووی: گەورەترین تاوان شەریك و هاوەڵدانانە بۆ خوا، لەدوای ئەو تاوانە ڕەنجاندن و تۆراندنی دڵی دایك و باوك دێت، لە کاتی ئەم قسانەی پێغەمبەر (ﷺ) پاڵدابوییەوە سەر شانی جا ڕاست بوویەوە و دانیشت و فەرمووی: لەدوای ئەو تاوانەش شایەتی دانی بە ناهەق و بەدرۆ دێت. ئینجا ئەوەندە ئەوەی دووپاتکردەوە هاوەڵان دەیانوت خۆزیا بێدەنگ دەبوو. متفق عليه.

بەڵێ موسڵمانانی بەڕێز شاهێدی دانی بە ناهەق و نارەوا کەسێ بەشیاو بزانی و شایەتی بۆ بدەی، یان ئەشهەدوبیلای بۆ بکەی لە کاتێکدا شیاونەبێ و ئەهلی ئەوە نەبێ ئەوا تۆ گەورەترین تاوانت ئەنجام داوە، جا وریایی خۆت بە، بزانە پەنجەکەت شایەتی بۆ کێ دەدات.




پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێ: (كُنْ فِي الدُّنْيا كأنَّكَ غَرِيبٌ أوْ عَابِرُ سَبِيلٍ)بوخاری. لە دونیا وەکو بێگانەو غەریبێ بژی یاخود وەکو ڕێبوارێ خۆت بێنەبەرچاو، ژیانی دونیا کاتییە با هەوڵ و کۆششی بۆ بکەین، چونکە بەراستی مرۆڤ دەبێت ئەو هەقیقەت بزانێ هەر چەندە تەمەنت بێت ڕۆژێ دێت بەکۆتایی دێت، بێگومان هەموو شتێك کۆتایی هەیە، منداڵی و گەنجی تاوەکو پیری..هتد، جا دەبینین کەسێ بۆ سەفەرێك تێشوو ئامادە دەکات کەچی لای هەمووان ڕۆشنە کە پێویستە ئێمە بۆ ڕۆژی دوایی خۆمان ئامادەبکەین و چاکترین تێشوو ئامادەبکەین ئەویش پارێزکارییە، بەو واتایەی کە هەرچی چاکەو فەرمانە جێبەجێیان بکەین و هەرچییەکیش قەدەغەو یاساغکراوە دووربکەوینەوە لێی و هەرچی سیفەت و ڕەوشتی جوان و مەزنە لەخۆمانیدا بەرجەستە بکەین و هەرچیش ناشرین و ناقۆڵاو نەگریسە خۆمانی لێ بپارێزین.

# دابەشکردنی میرات لە ئیسلامدا

ئەنوەر محی الدین

بەشی: دووەم

**بەناوی خودای گەورە،** لە ژمارەی پێشودا باسی ئەو هۆیانەمان کرد کەوا ئەو مرۆڤانەی میرات لێکدەگرن و باسی ئەو هۆیانەشمان کرد کەوا میراتگر ناتوانێت میرات بگرێت باسی ئەو پیاوانەشمان کرد کەوا میرات دەبەن.

**وە ئەو ئافرەتانەی میراتدەگرن بە کۆدەنگی زانایانی ئیسلام حەوت، ئافرەتن:**

١_کچی مردووەکە. ٢_ژنی مردووەکە یاخود ژنەکانی. ٣_دایکی مردووەکە. ٤_داپیر(نەنک)ی مردووەکە هەرچەندە بەرەو سەرەوەش بێت. ٥_خوشکی مردووەکە خوشکی لە باوکی بێت یان لە دایکی یان خوشکی لە دایك و باوکی. ٦_کچی کوڕی مردووەکە هەرچەند بەرەو خوار بێت. ٧_ئازاد کەری کۆیلە،واتە ئەگەر ئەم مردووە لە پێشدا کۆیلە بوو ئینجا کەسێك ئازادی کردبێت.

جا ئەگەر هاتوو ئەم پیاوانەی باسمان کرد (لەژمارەی رابردوو)هەموویان کۆ بونەوە تەنها(باوك و کوڕ و مێرد)میرات دەبەن بە یەکدەنگی زانایان،وە ئەگەر هاتوو ئەم ئافرەتانەش هەمویان کۆبونەوە ئەوە تەنها ئەو پێنجەیان میرات دەگرن(کچ،کچی کوڕ،دایك،خوشکی باوك و دایکی،ژن)جا ئەگەر هاتوو هەموو لەپیاو و ژنەکان کۆ بونەوە ئەوە تەنها ئەو پێنجەیان میرات دەگرن چونکە ئەمانە هیچ کاتێك بێبەش نابن لە میرات گرتن ئەوانیش (کوڕ،کچ،دایك،باوك،ژن یان مێرد)

**میرات دوو جۆرە:**

١_بەشە میرات(إرث بالفرض): (فرض) لەزمانی عەرەبی بەمانای بڕین وٌ دیاری کردن دێت. لەڕوی زاراوەی زانایاندا :ئەو بەشەیە کە بۆ میراتگر دیاری کراوە.

ئەو بەشە میراتەی لەقورئانی پیرۆز دیاری کراوە شەش بەشە(نیوە،٢/١) و (سێیەك،٣/١) و(چاریەك،٤/١) و (شەشیەك١/٦) و (هەشتیەك،٨/١)و(دوو سێ یەك ٢/٣)

٢_پشتە میرات(إرث بالتعصب): (عصب) لەزمانەوانیدا:واتە:خزمانی پیاون لەباوکیەوە هەندێکی تریش دەڵێن بەمانای توند کردنەوە و پاراستن دێت چونکە خزم پشتی مرۆڤ توند دەکات و دەپارێزێت. لەزاراوەی زانایانییشدا ئەو کەسەیە هەموو ماڵە میراتیەکەی دەبات لەدوای خاوەن بەشەکان(فرض)ەکان ئەگەر لەدوای خاوەن پشکەکان هیچی بۆ نەمایەوە ئەوا هیچی بەر ناکەوێت. ئەگەر خاوەن بەشەکان (فرض) و چەند میرات گرێکی(عصب) کۆ بینەوە ئەوا خاوەن بەشەکان بەسەرعەصەبەکاندا پێش دەخرێن بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دەفەرموێت(الحقو الفرائض بأهلها،فما بقي فلأولى رجل ذكر) رواه بخاري واتە:بەشە میراتەکان بدەنە خاوەنەکانیان،ئەوەی مایەوە بۆنزیکترین میرات گری پیاوە.

# چۆن هاوسەر هەڵدەبژێریت؟



کانیاو بلباس

ئافرەتی باش جوانترین چێژی ژیانە بۆیە پێداگری بکە لەسەر ئەوەی هاوسەرێك هەڵبژێری کاتی تەماشای دەکەی دڵخۆش بیت، وەکاتێك کە لێی دووریت شەرەف و ماڵ و منداڵت بپارێزێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: وە کەسانێك کە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ببەخشە پێمان پێمان لە هاوسەران و نەوەکانمان(منداڵەکانمان) ئەوەی چاوانی پێ گەش و هۆی دڵخۆشی بێت وە بمانکە بە پێشەوای پارێزکاران و لەخوا ترسان.

*پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ : لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ)البخاري ومسلم.

ئافرەت بۆ چوار شت مارەدەکرێ: بۆ ماڵەکەی و بنەماڵەو ناوبانگ و بۆ جوانیەکەی و بۆ دینەکەی، جا ئاینی هەڵبژێرە ئەگەرنا دەستت لەخۆڵەکەدا سواوە.

* نێردراوی خوا ئاینی هەڵبژاردچونکە پارە و سامان کۆتایی پێدێت و ناوداری دەمرێت و جوانیش کۆتایی پێدێت ئەوەی کە دەمێنێتەوە دینە.

*وە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دەفەرموێت: (الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ)اخرجه مسلم.

واتە: (دونیا بریتیە لە کەل وپەل و کاڵا، باشترین کاڵای دونیا ئافرەتێکی چاکە)

* وە ڕۆژێك عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) کە پێشەوای مسوڵمانان بوو بەناو کۆڵانەکان گوزەری دەکرد بۆ زانینی گوزەرانی خێڵەکان، گوێ لە ئافرەتێك بوو داوای لە کچەکەی دەکرد کە ئاو تێکەڵی شیر بکات کچەکە ووتی: پێشەوای بڕواداران عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) ڕەتی کردۆتەوە کە ئاو تێکەڵی شیر بکرێت .

دایکەکە ووتی: ڕۆڵەکەم .. خۆ عومەر ئێمە نابینی.

کچەکەش ووتی: ئەگەر عومەر نەمان بینی ئەوا خوای عومەر دەمانبینێ.

ئەوکاتەی کە ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه)چاکی کچەکە و دینی بینی خێرای کرد و خوازبێنی کرد بۆ کوڕەکەی (عاصم)،پاشان لەو ئافرەتە دایکی عومەری کوڕی عەبدول عەزیز پێنجەم خولەفای ڕاشدین لە دایك بوو.

# پلەو پایەی ئارامگران

هەڵوێست مامۆکی

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ (١٠)﴾ الزمر.

واتە: بەڕاستی دان بەخۆداگران بێ ژمارە پاداشتیان دەدرێتەوە.

کاتێ مرۆڤ تووشی ئافات و بەڵاو موسیبەتێک دێ، یان یەکێ ستەمی لێدەکات، لەم ساتەدا گەر ئارام نەگرێ بەڕاستی دەردێکی کوشندەیە و زۆرجار موسڵمانی وا هەبووە زۆر پارێزکارو لەخواترس بووە، بەڵام لەهێاست کێشەو مەرگەساتەکان خۆی بۆنەگیراوە و ڕەنگدانەوەی خراپی لێ کەوتۆتەوە، "پەنا بەخوا" کارێگەری خراپی لەسەر ئیمان و بیروباوەڕەکەشی دروست کردووە.

ئیمامی عەلی"ڕەحمەتی خوای لەسەربێ" سەبر و ئارامگرتنی کردووە بە سێ بەشەوە:

یەکەم: ئارامگرتن لەسەر فەرمانبەری خوا"جل جلاله".

دووەم: ئارامگرتن لەسەر بەڵاوگیروگرفت وناخۆشی.

سێیەم: ئارامگرتن بەرامبەر ئەنجامدانی خراپەو تاوان.

جا پێویستە مرۆڤی موسڵمان ئارامگربێ لەئاست پێشهاتەکان و بەکردارو لەمەیدانی وەسەرداهاتندا خۆی بگرێ، دواجار ئارامگریەکەی ڕەنگبداتەوە لە ئاکار و ڕەفتارو گوتارەکانیدا، نمونەی بەرزبێ، تا کەسانی تر چاوی لێبکەن و ببێ بەسەرمەشق و مامۆستا. وە هەر مرۆڤێ هێمن و ئارامگر نەبێ، بە دڵنیاییەوە مەحاڵە ئامانجەکانی بێتەدی و سەرکەوتن وەدەست بێنێ. بەپێچەوانەی ئەوانەی ئارامدەگرن، کارو ئاواتیان ڕۆژێ دێتە دی و خوای پەروەردگاریش پشتیان دەگرێ و لەگەڵ ئارامگران هەژماریان دەکا، ئەوەتا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ (٤٦)﴾ الانفال.

واتە: (خۆڕاگربن بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگراندایە).

ئارامگرتن زۆر گرنگەو مایەی سەرکەوتنە، هەموو ئەوانەی دەرهەق بە ناخۆشیەکانی ڕۆژگار ئارامگرن. بە ئارامگرتن گەورەترین کێشەیان لەکۆڵ بۆتەوە و سەرەنجام فەرەحنایی و خۆشی ڕووی تێکردوون.

ئارامگری بەراستی وەکو وتراوە (الصبر مفتاح الفرج) بەراستی هەر ئاواشە مرۆڤ کاتێ دەردو بەڵای بۆ دێ. ئەو کارە ناخۆشەو ئارامگری دەوێ. بەڵام کاتێ کە ئارامگردەبێ لەسەری دواتر بەری ڕەنجی ماندوو بوون و کۆشش و دانبەخۆگری دەوێ و لەبری کاردانەوە کە دەگونجێ کارەسات ڕووبدات چونکە زۆر کەس بەهۆی بوونی کێشەو تاقیکردنەوەیەکی خوایی دانی بەخۆدانەگرتووەو سنوری بەزاندووەو

سەرەنجامی خۆیی وکەسانی دیکەشی خەم تە یو مەترسیداریی و تورەیی خوای [illegible] ورە. وە ئەوەش بزانین لەگەڵ [illegible]بەرو ئارامگرییەك لەكاتی بەڵاو [illegible]وسیبەت و ناخۆشییەك دێتە پێش، [illegible]ە دەبێ مرۆڤی موسڵمان ئەوەی لا رۆشنبێت دوای ناخۆشی، هەڵبەت بەختەوەری و فێنكیەك بەچەشنی كزەبا ئۆخژەن دەبەخشێ و لەو نارەحەتیە دەردەچێ و خوا دەرووی خێرو خۆشی بۆ دەخاتە سەرپشت.

كەواتە گەر دەتەوێ خوا خۆشتی بوێ، لەسەر نارەحەتی و ناخۆشیەكان، ئارام بگرە.




لەبەر گرنگی راوێژ و پرس و مەشوورەت دەمەوێ بچینە سەر ژیانی خەلیفەی چاكساز: عومەری كوڕی عەبدولعەزیز (رەحمەتی خوای لەسەر بێ) چۆن وەرچەرخانێكی مێژوویی گەورە سازدەكاو چۆن هەڵبژاردنی لە كوڕاو كوڕو پشتاو پشت بە یاسای شوڕا دەگۆڕێ .

* خەلیفە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز ( رەحمەتی خوای لەسەر بێ ) هەر لە سەرەتای بوونی بە پێشەوای موسڵمانان، بنەمای راوێژ و مشوورەت دادەمەزرێنێ، لەمەڕ راوێژەوە كە بە دەروازەی رەحم و بەرەكەت لە قەڵەمی دەدا، دەڵێت:

(راوێژكردن و گفتوگۆ كردن دەروازەیەكی پڕ لە رەحمەتە، كلیلی بەرەكەتە، هەرگیز رەئی و بۆچوونەكان لەگەڵ ئەو دووانەدا بە هەڵەدا ناچن، سوربوون خاو دەكەنەوە).

* ئەو خەلیفە خواناسە بە هۆی دامەزراندنی ئەو ئەنجومەنی شورایەی كە لە زاناو داناو پیاوچاك و خواناسان لەشاری مەدینە دادەمەزرێنێ، بەرگێكی دیكە دەكاتە بالای جیهانی ئیسلامی و سیستەمی حوكمرانی بەوەی لە بنەماو نیزامی هەڵبژاردن لە بنەماڵەو پشتاوپشتی، بۆ بنەماو یاسای شوڕا، ئەو مافەی گەڕاندەوە بۆ دەستی موسڵمانان.

هەر بەم هۆیەوە هیچ بڕیارو هەنگاوێكی هەڵنەئەنا تا پرس و مەشۆرەتی بە زانایان نەكردایە، ئەمەش بووە هۆی سەركەوتنی كە لەو ماوەی ژیانیدا بە دادپەروەر و مشورگێڕ بناسرێ، چونكە هەموو كات داوای سەرزەنشت و ئامۆژگاری لە زانایان دەكرد، ئەوەتە بە ( عومەری كوڕی موهاجیری ) دەڵێ: (هەر كاتێ منت بینی وا لە حەقم لاداوە، ئەوا یەخەی كراسەكەم بگرەو رامبكێشەو بڵێ: ئەی عومەر ئەوە چی دەكەیت؟). بەڕاستی جێگای شانازیە.

ئەمە شتێكە موسڵمانان دەبێ بنچینەی شورا پیادەبكەن و لە هەموو پرس و كاروبارەكانیاندا رەنگ بداتەوە.

# کورتەیەک دەربارەی تەوبە

تەوبەکردن وگەڕانەوە بۆلای خوای بەبەزەیی، پێویستیەکە دەبێت مرۆڤ هەموو سات لەنێو بیرو زەینیدا خول بخوات، ئەگەر تووشی لادانیش بوو، هەر داوای تەوبەبکاو پەشیمان بێتەوە، خوای پەروەردگار لەقورئان دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ..﴿٨﴾﴾ التحريم...واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بەگەڕانەوەیەکی ئێجگاری.

مرۆڤ هەڵە دەکات، بەلام باشترینیان ئەوانەن کە تەوبە دەکەن ودەگەڕێنەوە لای خوا(جل جلالە)، تەوبەکردن بۆ بنەبڕکردنی ئەو گوناهو تاوانەیە کە ئەنجامتداوە لەڕابردوودا، ئەمێستاش کاتی پەشیمانبوونەوەیە، جاکاتێ دانت نا بەو هەڵەو گەڕایەوە بەرەو لای خوای پەروەردگار وەك ئەوە وایە گوناهت نەکردبێ بەبەڵگەی ئەم فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێ: ﴿التائب من الذنب كمن لا ذنب له﴾اخرجه ابن ماجه...واتە: (تۆبەکار لەتاوان وەك ئەوەیە کە تاوانی نەکردبێ.

ئەم تەوبەکردنە دەبێ بەدڵێکی ساف وبێ خەوشبێ بۆخواو جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەری نا بەم شێوە دەچیتە ڕیزی خۆشەویستانی خوا کە خوای پەروەردگار لە دەرهەقی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ ..﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة...واتە: (بەڕاستی خوا تەوبەکارانی خۆش دەوێت).




وە نابێ مرۆڤ دەستەوسان بوەستێ لەمەڕ ئەوەی گوناهێکی کردووە، چونکە ڕەحم و

بەزەیی و سۆزو میهری خوای بەسۆز ئەرەندە بەرفراوانە هەموو شتێكی گرتۆتەوە وەكو دەفەرموێ: ﴿ ... وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ... ﴾ الأعراف... واتە: (وە بەزەیی و رەحمەتیشم هەموو شتێكی گرتۆتەوە).

وە دەربارەی ئەو بەندانەیشی كە نغرۆبوونە گەرمك و مەیلی گەڕانەوەیان هەیە بۆلای خواو پەشیمانن. هەر چەندە كۆڵێ گوناهیان كردووەو لە شانیانە. جا نابێت بێ نەود و رەشبینی هەوزەڵی بێنێت بۆیان، چونكە خوای پەروەردگار لەم دیدگایەرا بەیانی ئەوەی كردووە كە بێ هیوانەبین لە ئاست لێبوردەو رەحمی ئەودا، چونكە خوای میهرەبان سۆزی زۆرە بۆ بەندەكانی، وەكو لە قورئانی دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر....واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)بڵێ: ئەی بەندەكانم ئەی ئەوانەی كە خۆتان زۆر گوناهبار كردووە نا ئومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا(جل جلاله) چونكە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەكانتان خۆش دەبێت بەڕاستی هەر ئەوە لێبوردەی بەبەزەییە).




كەواتە ئەی موسڵمان، ئەی ئەو كەسانەی نغرۆ بوونە لە تاوان و گوناهان، بێ هیوامەبەو قۆڵت هەڵماڵەو ڕابەو تەوبەیەكی یەكجارەكی بكەو بەرەو لای خوای پەروەردگار بگەڕێوەو هەرچی كۆسپ و تەگەرەیە لەبەر دەمت لایبەو بجەنگەو كۆشش بكە لەگەڵ نەفسی بەدكارو فڕو فێڵەكانی شەیتانی نەفرینش هەڵوەشێنەو ڕووی خۆت وەرچەرخێنە لێیان و ڕووەو لێخۆشبوونی خوای پەروەردگار هەنگاو هەڵێنەو ئاراستە بگرە، لەخوای پەروەردگار داوا بكە نزیكەو وەڵامگۆی هەموو كەسێكە، لە كۆتاییدا ئەو ئایەتە دەخەینەڕوو بۆ كەسانێ كە ئەو قسانەی ئێمە لە گوێ دەكەن، داوا بكەو بۆ خوا بصولحێ، ئەوەتە خوای بەسۆزو میهرەبان، لە قورئانی ڕێنیشاندەرو بەرنامەی ژیان، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾ البقرة. .واتە: (هەر دەمێ بەندەكانی من پرسیاریان لێكردیت دەربارەی من ئەوە بێگومان من لێیانەوە نزیكم گیرا دەكەم نزای نزاكاران هەر كاتێك هاوارو نزام لێ بكەن دەی با ئەوانیش بەدەنگ منەوە بێن وە بڕوام پێ بهێنن بەڵكو ڕێی ڕاست بدۆزنەوە).

# منداڵ بۆ لە قوتابخانە دەترسێ؟

و: سۆما عەبدوڵلەتیف

ترسان هەڵچوونێکی ئاساییە، خوای گەورە لە ناخی بەندەکانی داناوە، بۆ پارێزگاری لێکردنی لە مەترسیەکان وپاراستنی سەلامەتی، وایکردووە وەلام بداتەوە بە ترسان لەکاتی بوونی مەترسی بۆ پاراستنی گیان، ئەم پاڵنەرەش یارمەتیمان دەدات بۆ ڕاهاتن لەگەڵ ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژین.

ترسان لە منداڵیدا لە تەمەنی سەرەتاوە هەستی پێدەکرێ، کاتی کە ڕووخسارێکی نەناسراو دەبینێ بەرەو لای دایکی ڕادەکا، و زیاد لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی هەست بە ئارامی و ئاسایش دەکات، هەندێ جار ئەو ترسە لەگەڵی دەمێنیتەوە تا تەمەنی گەورەیی. بەتایبەت لە تەمەنی چوار بۆ پێنج ساڵی کاتێك کە دەنێردرێتە باخچەی ساوایان بەدیار دەکەوێت زیاتر پەیوەستە بەدایکی و دەترسێ لێی جیابێتەوە.



بێگومان ئەو کاتەی کە منداڵ ئەچێتە قوتابخانە بۆ یەکەمجار سەرەتا هەست بە ترسان و دڵەڕاوکێ سروشتی ئەکات بەتایبەت ئەگەر هاتوو ئەو منداڵە نەچووبێتە باخچەی ساوایان کاتێ دەچێتە قوتابخانە دەترسێ و دەست بەگریان دەکات، ئەمە شتێکی ئاسایی هەموو منداڵێك پێیدا تێپەڕدەبێت، جگە لەوانە کاتێ کە دەچێتە

قوتابخانــە ئــەو تــرس و ڕاڕایــەو دڵەڕاوکێیــەی دەبێتــە هــۆی ئــەوەی کــە تووشــی ئازاری گەدەو سک بێت. زیاتر دەگریـــی و هۆگـری دایکـی دەبێت.

لـەو هۆکارانـەی دەبنــە هــۆی ترس لـە منداڵ بریتیــە لــە شـــێوازی پێگەیاندنـــی خێزانی لەوانە: پاراســتنی لــە ڕادەبـــەدەر و لاواندنــــەوەی زۆرو نازکێشان و دڵەڕاوکێـی دایک لەسەری و زۆر پەیوەستبوون پێیەوە کاتێ ئەوانەی لـــەخۆی گـــەورەترن کـــە باســـی قوتابخانەدەکـەن مامۆستاکان لەگـەڵیان خــراپن و کەمبوونــەوەی یــاریکردن و خەریکبوون بە ئەرکی قوتابخانەو یاخود بوونـی هەنـدێ هەڵوێـستی ناخۆش کـە تووشـی بـووە لـە باخـچەی ساوایان، لەگەڵ بوونی هەندی کێشەی دەروونی، لەوانە ترسان و جیابوونەوەی لە خێزان.



لەشێوازەکانی چارەسەرکردنی ترسی منداڵ لە قوتابخانە:

باشـترکردن و بـەهێزکردنی پەیوەنـدی نێوان منداڵ و دایک و باوک بۆ ئەوەی زیـاتر متمانە بەخۆی بکات، بۆ ئەوەی بتوانێ بۆ ئەو ژینگـەی دەچێتە ناوی ڕابێت.

وە پێویـــستە بنێردرێتــــە باخــچەی ساوایان. لەناو خێزان وێنەیەکی جوانی قوتابخانـەی بـۆ دروسـت بکرێـت، لـە قوتابخانەش زیاتر گرنگی بەو قوتابیانە بدرێت کە دەترسێن، بەوەی دیاریان پێ بدرێت، تاوەکو ڕادێن، دەبێت بیانویەکانیان بنەبڕ بکرێت بۆ نمونە: منداڵ لەم کاتانەدا زۆر دەڵێــن: ســگم دێــشێ یــاخود زۆر میزکـردن و..هتـد، دەبـێ بیانلاوێنینــەوە تاوەکو هانا بۆ دایک و باوکیان نەبەن کە ئەم ئەرکە لەلایەن مامۆستاکانیانەوە دەکرێت، پێدانی کاتی تەواو بەیاریکردن ، وا چاکە چەند ڕۆژێ سەرەتای دەوام دایکی لەگەڵی بمێنێتەوە تاکۆتایی دەوام، ئەگەر بگونجێ، قوتابخانـە بەلایـەنی قوتابییەکـەوە گۆڕانـی ژینگەیـە لـە ژینگەیـەکی داخـراوەوە کـە لەدایکی نزیکە بۆ ژینگەیەکی داخراو کە نازانـێ کێـی تێدایـەو کەسـی تێدانانـاسێ، بــەڵام ئێمــە دەتــوانین وای لێبکــەین کــە تاقیکردنەوەیەکی بەسوودبێت بۆ ئەو کە کۆمـەڵێک زانیـاری زانـستی و کۆمەڵایەتـی بەدەسـتبێنێ،ئەگەر هــاتوو بەشـێوەیەکی دانــایی و ئــارامگرایی مامەڵــەی لەگــەڵ دابکەین.




## هەڵوێست و مامەڵە لەگەڵ کەسی بیدعەچی و بیدعەکار

پێش هەموو شتێ پێویستە موسڵمانان برایەتی و یەکڕیزی نێوانیان بپارێزن، بۆ ئەو مەسەلەیەش کەوا چۆن هەڵوێست وەرگرین و چۆن چۆنی مامەڵەو هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسێك بکەین کەبیدعەچیەکی تەواوەو زۆریش هەوڵی لەگەڵ دەدرێت و شتەکانی بۆ ڕۆشن دەکرێتەوەو بشزانێ هەق لەکوێیەو ئەویش لەو کارە داهێنراوانە وازنەهێنێ ئەوە پێویستە هەر پەیوەندی لەگەڵ بهێڵرێ و بەئەندازەی ئەوەندە عیلم و زانستە مامەڵەو هەڵسان و دانیشتنی لەگەڵ دەکرێ ئەگەر تۆش کاریگەریت لەسەری نەبێ، با ئەو کاریگەری لەسەر تۆدا بەجێنەهێڵێ و گیرۆدەی ئەوەت بکات کە ببی بەبابەکی بیدعەکار، هەر چەندە زۆر لەزانایان و چەند ئیمامێك ڕەئیان وایە بەدروستی نازانن لەگەڵ کەسی بیدعەچی دانیشی و قسەی لەگەڵ بکەی وەکو(فیض بن عیاض (رحمە اللە) دەڵێ: (إذا رایت مبتدعا في طریق فخذ في طریق آخر، ولایرفع لصاحب بدعة إلی اللە(عز وجل) عمل، ومن أعان صاحب بدعة فقد اعان علی هدم الاسلام).

یانی: (ئەگەر بیدعەچیەکت بینی لەرێگایەك تۆ پێچکەوە بۆ رێگاکەی تر، وە کردەوەی خاوەن بیدعە بەرزنابێتەوە بۆ لای خوا(عز وجل)، و هەر کەسێ یارمەتی دەری بیدعەچیەك بێ، وەکو ئەوە وایە کە یارمەتی دابێت بۆ ڕوخانی ئیسلام) (ئەوەش زیاتر دەربارەی ئەو بیدعەچیانەیە کە بیدعەکەیان بیروباوەڕییە...)

دەربارەی ئەو کەسانەش کەنێوی بیدعەچی دەهێنێ و غەیبەتی دەکات. هەمدیسا باسی ئەوە دەکەن کەنێوبردن و خەڵك ئاگادارکردنەوە لەبیدعەکەی شتێکی ئاساییە، ڕەبیعی کوری صبیح لەحەسەنەوە دەڵێ: (لیس لأهل البدع غبیة).

واتە: نێوبردن و غەیبەتکردنی ئەهلی بیدعەو بابای بیدعەچی بەغەیبەت دانانرێ.

بەکورتی دەڵێین: ئەوەی لەم چەند پەیڤە دیار دەکەوێ ئەوەیە کە پێویستە وریای ئەو کەسانەبین کە بیدعەچی و بیدعەکارێکی زۆریان لێ ڕەنگدەداتەوەو هەرچی بیدعەیە بەسوننەتی دەزانن ئەوانە دەبێ لەئاستیاندا حەزەرو هەڵوەستەی

لەبەرامبەردا بکرێ هۆشیارانەو بەلێزانیەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ. وە با سەرەرادیش نەبینەوەو بێ نومێدنەبین لەئادەوژگاری و بەیانی ئەم باسە سابەڵکو رۆژێ بێت ئەو شتەی لەلا دروست بێت ودەستهەڵگرێ و واز لەهەموو بیدعەیەك بهێنێ، کەواتە با هەوڵدانمان بۆ تێگەیاندنی خەڵکی و رونکردنەوەبێ. کە زۆر لەوە لەپێشترە خۆمان لەو جۆرە کەسانە بەدوور بگرین و لە ناو بیدعەدا بتلێنەوە.

## بیدعەو کاری چاك و خێر

هەندێ کردەوە هەرچەندە بەرواڵەت خێرو چاکن بەڵام هاوەڵان بەبیدعەیانزانیوەو بەشتێکی زیادەو داهێنراویان لەقەڵەم داوە وەکو ئەو بەسەرهاتەی عبدالله کوری مسعود(رەزای خوای لێبێ) و کۆمەڵە کەسەکەی نێو مزگەوتێ کەزیکریان دەکرد بەسەرهاتەش ئاوایە: ( لە عەمری کوڕی یەحیاوە فەرمویەتی(گوێم لە باوکم بوو باسی باوکی دەکردو دیگوت: ئێمە لەبەر دەرگای ماڵی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دادەنیشتین لەپێش نوێژی بەیانی، جا کە لەماڵ دەهاتە دەرەوە بەپیادە لەگەڵیان دەرۆیشتین بۆ مزگەوت، لەو کاتەدا(ئەبو موسای ئەشعەری) هاتە لامان و فەرمووی: ئەبوو عەبدولڕەحمان (کەکونیەی ئیبن مەسعود بوو) هاتۆتە دەرەوە؟ وتمان نەخێر، ئەویش لامان دانیشت هەتاکو ئیبن مەسعود هاتە دەرەوە، جا کاتێك هاتە دەرەوە هەموومان هەستاین و ئەبو موسای ئەشعەری بەئیبن مەسعودی وت باوکی عەبدولڕەحمان پێش ئێستا لە مزگەوت کارێکم بینی بەباشم نەزانی، وە سوپاس بۆ خوا واش دەزانم هیچم نەبینیوە ئیللا خێر نەبێت، وتی ئەو کارە چی بوو؟ ئەبو موسای ئەشعەری وتی ئەگەر نەمریت دەیبینیت، ئەنجا وتی خەڵکانێکم بینی لەمزگەوت بازنەیی دانیشتبوون چاوەڕوانی نوێژیان دەکرد، لەهەر بازنەیەکدا پیاوێکی تێدایەو هەموویان(بەردیان) بەدەستەوەیەو پێیان دەڵێت: سەد جار بڵێن(الله اكبر)،ئەوانیش سەدجار(الله اكبر)دەڵێن، پاشان دەیگوت سەدجار بڵێن(لا إلە إلا الله) ئەوانیش دەیانوت، پاشان دەیگوت سەدجار بڵێن (سبحان الله) ئەوانیش دەیانوت، ئیبن مەسعود بە ئەبو موسای ئەشعەری وت: ئەی بۆ فەرمانت پێ نەکردن بەوەی کەخراپەکانی خۆیان بژمێرن و منیش ئەوە بگرمەئەستۆ کە هیچ لەچاکەکانتان نەفەوتێت لای خوا، پاشان رۆیشت بەرەو مزگەوت و ئێمەش لەگەڵیدا رۆیشتین، تاوەکو رۆیشتە لای یەکێك لەو بازنانەو لایان ڕاوەستا ئینجا پێیانی وت: ئا ئەمە چییە دەتانبینم دەیکەن؟ وتیان باوکی عەبدولڕەحمان ئەمە دەنکە چەوە(وردە بەردە)(تەکبیرو تەهلیلەو تەسبیح و تەحمید)ی پێ دەژمێرین، ئەویش وتی: دەسا خراپەکانتان بژمێرن من بەڵێنتان دەدەمێ کە هیچ لەچاکەکانتان ون نابێت، واوەیلا بۆ ئێوە ئەی ئوممەتی موحەممەد! ئەوە چ زوو لەناوچوون! خۆ ئەوەتا هێشتا صەحابەکانی لەنێوتاندا زۆرن و ئەوەش جلەکانی پێغەمبەرە(ﷺ)هێشتا نەزریون، ئەوەش و قاپ و قاچاغەکانیەتی هێشتا نەشکاون و لەناونەچوون، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە یان ئێوە لەسەر رێگاو رێبازێکن کە رێنمایکارترە لەرێگاو رێبازەکەی موحەممەد(ﷺ)یان دەرگای گومڕایی دەکەنەوە؟! وتیان سوێند بەخوا ئەی باوکی عەبدولڕەحمان مەبەستمان هیچ نییە تەنها خێرو چاکە نەبێت، ئەویش وتی: ئەی نازانن چەندین کەس هەیە مەبەستی خێرە بەڵام ناپێکێت!

پێغەمبەر(ﷺ)پێی فەرموین: کۆمەڵێك قورئان دەخوێنن کەچی لەگەرویان تێناپەرێت، بەو خوایە دوور نییە زۆرێك لەئێوە لەوانە نەبن، ئەنجا رۆیشت و پشتی تێ کردن، (عەمری کوڕی سەلەمە) وتی: لەرۆژی(نەهرەواندا) تێکڕای ئەوانەمان بینی لەگەڵ خەواریجەکاندا تیرو ڕمیان لێ دەداین) اخرجه الترمذي.

ئەوەی لەم دوو تەوەری ئەم ئالقەیە بەدی دەکرێ و دەفامرێ ئەوەیە:

یەکەم: پێویستە بانگەواز بەشێوەیەکی نەرم و نیان و لێزانیەوە بۆ ئەو جۆرە کەسانەبچین کە بیدعەچی و بیدعەکارن، دواجاریش گەیاندنمان لەسەرەو نەرم ونیانیش لەهەرشتێ جوانی دەکات.

دووەم: مەلەل نەگرتن و بێ تاقەت نەبوون و نائومێدنەبوون لێیان گرنگ ئەوەیە ساردنەبینەوەو ئامۆژگاری ئەو کەسانەبکەین و ئامۆژگاریش سروشتی وایە کەم و نۆر و نوو و دوور کاریگەری خۆی دەبێت.

سێیەم: ئەوانەی کە بیدعەچین و ئەوانەیشی کە بیدعەکارن بەلای خۆیانەوە ئەو کارەی دەیکەن خێرو چاکەو لە شەرع هەڵێنجراوە، بەڵام مادام شتێ فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ی لەسەر نەبێت، دەبێت لێی دورکەوینەوەو ئەنجامی نەدەین.

چوارەم: کارەکەی ئەم کۆمەڵە کەسە هەمووی تەواو بوو: کە تەسبیحات و زیکریان دەکرد هەمووی لەفەرموودەی صەحیحدا هاتووە بەڵام لە چۆنیەتیدا مادام موافیقی سوننەتی پێشەوامان(ﷺ)نەبوو ئەوە بەداهێنراو دادەنرێ.

ئەمانەو کۆمەڵێ شتی دیکە لە بەشی داهاتوو باسی دەکەین کە دەبێت هەموو کارێك لە عیبادەت دوو مەرجی تێدابێت ئەگەرنا بە بیدعە دادەنرێ.

## وتەی ناوداران

## هیچ کەس بێ ئازایەتی و ناخۆشی دیتن، ناگاتە پلەی بەرز



## چی لەم وێنەیە وەردەگیری؟




ئامانجەکانت لەسەر ڕاستی بنیادبنێ




کابرایەك مەڕێکی بۆ خۆی کڕیبو کاتێ لــــــە ئۆتۆمبێلــــەکــــەی هێنایە خوارەوە ،، یەکســـەر مەڕەکە هەڵهات و کابراکەش دوای کەوت.تا ئەم ئاژەڵە خۆی کرد بە ماڵە هەتیوێکدا!..!

دایکی منالە هەتیوەکان هەمـــوو ڕۆژێك دەرگای ماڵەکەی بە کـــــراوەی بەجێ نـــەهێشت هەتاوەکـــو خێرمـــــەند کە خوارد و پۆشاك و شتی هێنا، ئەم لێی وەربگرێت کاتێ ژنەکە یەتە دەرەوە لە ماڵەوە ،،،کابرای دراوسێیان بە ماندووی ئەبینێ ،، پێی ئەڵێت خوا ئەم کارەتی بە خێر گەیاندبێ..

ئەم پیاوش ئەو دڵخۆشیەی دایکی هەتیوەکان ئەبینێ تەنها پێی ئەڵێت ،، خوشکەکەم خوا قبوڵی بکات و تۆش لە کەم و کوڕیم ببورە، بۆ ڕۆژی دوای کابرا چوە دەرەوە بۆ ئەوەی مەڕێکی تر بکڕێ ،،بینی ئۆتۆمبێلێك وەستاوە و مەڕێکی زۆری تێدایە ئەویش مەڕێکی قەڵەوتری لەوەی دوێنی هەڵگرت و پرسیاری نرخەکەی کرد .. فرۆشیارەکە پێی وت ئەمە هیچ نرخێکی نیە ،، لەبەرئەوەی من ئەمساڵ خوای گەورە ڕزقی دام بە لەدایکبونی مەڕیوماڵاتێکی زۆر ..منیش لە خۆمم گرتبو (نەزرم کردبو) ،،کە مەڕوماڵاتم زۆربێت یەکەم کڕیار کە دێت وەك دیاری پێی ببەخشم..ئەمەش نسیبی تۆبوو، تۆ چوزانیت چاکە لە کوێ و کەی دێتەوە ڕێت؟!

خوای گەورە ئەفەرمێت: من ذا الذي يقرض الله قرضا حسنا فيضاعفه له أضعافا كثيرة والله يقبض ويبسط وإليه ترجعون " ٢٤٥ سورة البقرة.

سەرووتار

# چۆن لە قۆناغەکانی خوێندن سەرکەوتوبین؟

سەرنووسەر

بێگومان بەر لە   کردنەوەی دەرگای خوێندن و بگرە تا داخرانی، کەسانێ لەم نێوەندەدا دەبینین هەیە بەرێکی پرۆسەکە بەرێ دەکات بە بەرنامەو کات بۆدارێژراو هەیشە بەبێ بەرنامە وەکو شتێکی ئاسایی و عادەتی وەکو لەگەڵ عامێ بچووە شامێ رۆژگاری ئەم ساڵەی خوێندنی بەرێ دەکات، جا لەم سۆنگەوە وەکو بەرچاوڕۆشنیەك چەند ئادابێك دەخەینەڕوو کە پێویستی بەهەڵوەستەی زیاتر دەکات، ئەمما ئێمە بە پوختێ بۆ ئێوەی خۆشەویست دەخەینەبەردیدە بۆ وێنە:

*سەرەتا نیەتمان پاك دەکەین و بەناوی خوا دەست پێدەکەین.

*خۆمان دەرازێنینەوە بە ڕەوشتە جوانەکانی وەکو: وەفابوون بەرامبەر مامۆستاو هاوپۆل و قوتابخانە، راستگۆیی لەگەڵ خودی خۆت و خوێندن و دەوروبەرت، متمانە بەخۆبوون و، ورەبەرزی و بەهیمەتەوە ڕوانین بۆ خوێندن.

*رێزی مامۆستایان دەگرین و بەئەدەبەوە مامەڵەیان ڕەگەڵ دەکەین.

*پاکراگرتنی ژینگەی نێوپۆل وقوتابخانە، وەکو چۆن ماڵمان بەپاکی ڕادەگرین.

*ئامادەکردنی کەرەستەی خوێندن و قوتابخانەو زیادەڕەوی ناکەین و شتی بێ سود ناکڕین.

*خوێندن لەکاتێکی گونجاو وەکو دوای نوێژی بەیانی و کاتەکانی شەو و هەرکاتێك خۆت بەگونجاوی دەزانی، و خوێندن لە ژوورێکی هێمن و بێ تەلەفزیۆن و وێنەو نەخشە، و بێدەنگ کردنی مۆبایل یاخود کوژانەوەی، وە لەم شوێنەی دەخوێنرێت دەبێ روناکی هەڵبگیرسێت و کۆنترۆلکردنی ساردی و گەرمی بکرێت و تا بکرێ خوێندن لەسەر مێزو کورسی بێت، یاخود هەر شێوەیەك کە خۆت پێت خۆشە، وە چەند جارێك بابەتەکە بخوێنەوە واتا: تێگەیشتن دواتر لەبەرکردن، کات بەفێرۆنەدان و خوێندنی رۆژانە.

لەنێو پۆلدا گوێگربە و بیرو هۆشت با لای وانەکان بێت، وە پرسیارکردن دەربارەی ئەوەی نایزانیت، وە دیاریکردنی خاڵەگرینگەکان و تانوسێك بۆ نوسینی شتەگرنگەکان.

دەبێ قوتابی ئارامگربێت و نارەحەت نەبێت بەوەی مەلەل و بێ تاقەتی چنگی پێ بچنێ، وە لەکاتی تاقیکردنەوە خۆی چاك ئامادەبکات و بە ورەوە بەرەو هۆڵەکانی تاقیکرانەوەبچێ ..ئەمانەو چەندان ڕێنمایی دیکە دەتوانین لەخۆمانی بەرجەستەبکەین، بەهیوای سەرکەوتن بۆ هەموو قوتابی وخوێندکاران.